# بەسەرهاتی سەگێك لەسێبەرەکەیدا

## یوسف عیزەدین

کتێب:بەسەرهاتی سەگێك لە سێبەرەکەیدا

بابەت:چیرۆك

نووسەر:یوسف عیزەدین

نەخشەسازی بەرگ:

ژمارەی سپاردن:

تیراژ:

چاپ و بلاّوکردنەوە:

## پێڕست

# بەسەرهاتی سەگێك لەسێبەرەکەیدا

**–1–**

بەدرێژایی ئەو چەند ساڵەی کەوەك پەناهەندەیەك لەشاری شۆلۆ_ی کەنار دەریادا دەژیام، نەمویستبوو بچمە نێو ئەو گەڕەکە دێرینەی کە بە گەڕەکی ئینگلیزەکان ناسرابوو، سەیریش لەوەدا بوو نە ئینگلیزەکان هیچ پێوەندییەکیان بە دروستکردنی ئەو گەڕەکەوە هەبوو، نەبەدرێژایی مێژووی ئەو گەڕەکەش کەسێکی بەڕەچەڵەك ئینگلیز لەو گەڕەکەدا ژیابوو، بەو پێیەی کە لەتەنها کتێبێکی تایبەت بەو گەڕەکەشەوە باسی لێوە کرابوو، تائێستا کەس لەوە حاڵینەبووە کە بۆدەبێت ئەو ناوەیان لەو گەڕەکە نابێت؟ ئەمە جگە لەوەی کەنەشدەزانرا کێیە ئەو کەسەی کە بۆ یەکەمجار ئەو ناوەی لەو گەڕەکە ناوە.

دەماو دەم شتی سەیرو سەمەرەیان لەبارەی ئەو گەڕەکەوە دەگێڕایەوەو وەك باسدەکرا، باران پێش ئەوەی لەهیچ شوێنێکی شاری شۆلۆ_دا ببارێت لەوێ دەبارێت، باڕەش تەنها لەنێو کۆڵانەکانی ئەو گەڕەکەدا هەیەو گڤەی دێت، پشیلەو سەگی بەرەڵڵا تەنها لەو گەڕەکەدا بەرچاو دەکەوێت.

هەموو ئەوانەش کە بە گەڕەکەکەدا گوزەریان کردبوو، سەرسامی گومەزو قەیسەریەو کۆلانی تەسك و ترووسك و چوخم و حەمام و زۆر سیمای رۆژهەلاٌتییانەی تری بووبوون، سەرباری ئەوەی خەڵکێکی تێکەڵ و پێکەڵی جۆراوجۆر لەوێدا دەژیان، هەر لە ماسیگرو دزو گەوادو فاحیشەو ئەو هونەرمەندە توریستانەی کەلەبەر هەر هۆ و هۆکارێك بێت ئەو گەڕەکەیان دەکردە مەنزڵ.

دیارە گەر هەر لەسەرەتای گەیشتنم بۆ شاری شۆلۆ ئەو پیرە پیاوە هیندییەم نەدیتبا، نەمهێشتبا لە هێڵە تێکەڵ و پێکەڵەکانی نێو لەپی دەستم وردبێتەوەو رێم پێنەدابا زارە کەفگرتووەکەی لێك بترازێنێت و ئەوەی کە پێی گوتم نەیگوتبا،ئەوە دەمێکبوو ئەو گەڕەکەم دیتبوو.

هەر کەبینیمی وەدووم کەوت، سەرەتا وامزانی دەرۆزەکەرەو لەوەدابوو دەست بخەمە گیرفانم وشتێك پارەی بدەمێ، دەستی گرتم ولەچەقی رێگەکە دووری خستمەوەو بردمییە پەنا پەیکەری کابرایەکی حەپەساو کە لەهیچ شتێکی نەدەڕوانی، دەیان کۆتر بەدەوری پەیکەرەکەدا ئەو دەنکە گەنمانەیان کۆدەکردەوە کە پیرێژنێك تۆزە تۆزە بۆی رۆدەکردن. پیرە پیاوە پرچ درێژەکە سەرەتا تەنها لە لەپی دەستێکمی دەڕوانی، دواتر ئەویتریان و جارێکی تر ئەمیان و ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام بوو تا لەپڕ نیگاکانی بەتەواوی لەسەر هێڵێکی چەماوەی نێو لەپی یەکێك لەدەستەکانم گیرسایەوەو ئەوەندە بە عاجبایەتییەوە تێی دەڕوانی هێندەی نەمابوو بۆ خۆشم وێنەو پیت و لوغزی تێدا ببینمەوە، بەچەشنێك خۆی شپرزەکردبوو دەتگوت دەعبایەکی پیاوخۆر وەدووی کەوتووەو ئەمیش لەترساندا چۆتە نێو کۆلانێکی داخراو و ئیدی نازانێت خۆی بەکوێدا بکات و لەکوێوە هەڵبێت.

زارە کەفگرتووەکەی بەش کردەوەو بە زوبانی عەرەبی گوتی:

(تۆ جگە لە ناوی خۆت هەموو شتێکت لەیاد چۆتەوە، گەر دەتەوێت بەئارامی و ئاسودەیی بژیت بەهیچ شێوەیەك مەچۆرە نێو گەڕەکی دێرینی ئینگلیزەکان، تا یادەوەرییەکان بەزەینتدا ختوورە نەکەن. تۆ لەئێستادا جگە لەناوێك هیچی تر نیت و نابێت لەوە زیاتریش بیت، تەنها شتێکیش کە دەبێتە مایەی وەبیرکەوتنەوەی هەموو ئەو شتانەی کە لە زەینتدا سڕدراونەتەوە ئەو گەڕەکە دێرینەیە).

ئەوەی لەو کاتەدا بووە مایەی پرسیار و بەدرێژایی رۆژانێکیش هەر بیرم لێ دەکردەوە، ئەوە بوو کەبۆ دەبێت پیرە پیاوەکە بە عەرەبی ئەو قسانەی پێگوتبێتم.

راستییەکەی هیچ پێوەندییەکم لەنێوان گەڕەکی ئینگلیزەکان و هەموو ئەو شتانەی کەلەبیرم کردبوو نەدەدۆزییەوە، ئەمە جگە لەوەی دوای سێ ساڵی مانەوەم لەنێو نەخۆشخانەی دەروونیی ئەو شارەی کە جێم هێشتبوو، گەیشتبوومە ئەو یەقینەی کە هەموو ئەو شتانەی بەدرێژایی ساڵانێك لە مێشکمدا جێی خۆی کردبۆوە سڕدراوبوونەوە، چونکە گەر دکتۆرەکەم بەر لەوەی لەنەخۆشخانە مەرەخەسم بکات هەندێ شتی پێ نەگوتبام، ئاستەمبوو لەو کاتەدا وەبیرم کەوتبایەتەوەو زانیبام:

(پاش چەند مانگێکی مانەوەت لە نەخۆشخانەکەماندا هەواڵی مەرگی دایکتمان پێگەیشت هەر لەو رۆژەوە کەتۆیان هێنایە نێو نەخۆشخانەکە ئەو مردبوو، بەڵام پاش چەند مانگێك و بەڕێکەوت کەسێکی نەناسراو ئەو راستییەی کەشفکردبوو کە بە مەبەستێك چووبووە نێو خانووەکەتان و بەبۆنی جەستەی گەنیوو و هەڵوەشاوەی دایکت وروکاس بوو بوو، بەپەلە چووبووە دەرو لە دەرگای یەکێك لە ماڵە دراوسێیەکانتانی دابوو، چاوەڕێی ئەوەی نەکردبوو دەرگاکەی لێبکەنەوە، هەر کە گوێی لە نزیکبوونەوەی دەنگی پێی کەسێکی پشت دەرگاکە بووبوو گوتبووی:" پیرێژنێك لەنێو خانووی نێوەڕاستی باخچە گەورەکەدا مردووە".

تا کەسەکەی پشت دەرگاکە دەرگاکەی کردبۆوە، هەروەك ئەوەی کە غەیب بووبێت، لە دووری سەد مەتریشەوە کەس بەدی نەکردبوو.

هەر کەلێرە چوویتە دەرێ خۆت ماتەڵ مەکەو یەکسەر خانووەکەتان بفرۆشەو بە پارەکەی بۆ دوورترین پانتاییەکی دنیا برۆ، تا هیچ شتێك ئەم شارەت وەبیر نەخاتەوە، تەنها ئەوەندەش لەبارەی خۆتەوە بزانە کە تۆ پاش خوێندنەوەی کتێبی –گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکانی شار– باری دەروونیت گۆڕانی بەسەردا هات و تێکچوویت. هەرچەندە کتێبێکی ئاساییەو باس لەهەموو گۆرانیبێژە دەنگخۆشە مردووەکانی شار دەکات کە هێشتاکەش هەر دەتوانن لەنێو گۆڕەکانیانەوە و لە شەوە زۆر تاریکەکاندا گۆرانی بچڕن. رەنگە هۆکاری تێکچوونی باری دەروونیشتان لە بێباوەڕیتانەوە سەرچاوەی گرتبێت کە رەنگە پێتان وانەبێت گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکانی ئێمە لەدوای مەرگیش دەتوانن گۆرانی بڵێن، بەڵام من بۆ خۆم هەر بۆ تاقیکردنەوەی راستی و دروستی ئەوەی کە لەو کتێبەدا هاتووە، لە شەوێکی زۆر تاریکدا چوومە زیارەتی گۆڕەکانیان و پاش کەمێك لە مانەوەم سەرسامبووم بەو دەنگە جۆراوجۆرە سیحراوییەی کە یەك لەدوای یەك لە گۆڕەکانیانەوە دەهاتە دەرێ).

گەرچی دەبوو پاش فرۆشتنی ئەو خانووەی کە بە میراتی بۆم مابۆوە یەکسەر رۆیشتبام، بەڵام

خولیای زانینی نهێنیی ئەو کتێبە وایلێکردم یەك دوو هەفتە بمێنمەوە و عەودالی ئەوە بم کە وەچنگم کەوێت و بیخوێنمەوە، هەر بۆیە بێجگە لەوەی هەموو ئەرشیفی لیستی ناوی کتێبی کتێبخانەکانم هەڵدایەوە و زۆر بە وردی بە شوێنیدا گەڕام، کتێبفرۆشی ناو شاریش نەما راینەسپێرم تا ئەو کتێبەم بۆ پەیدا بکات، دیارە هەموشیان بە داواکارییەکەم سەرسام دەبوون و تەنانەت زۆریشیان وایاندەزانی پێیان رادەبوێرم و هەموشیان تەنها یەك وەڵامیان دەدامەوە:

(بەدرێژایی مێژووی ئەم شارە نەك هەر دەنگخۆشێکی تێدا هەڵنەکەوتووە، بەڵکو گۆرانیبێژیشی تێدا نەبووەو نەشمان بیستووە کەسێکی خەڵکی ئەم شارە گۆرانیی گوتبێت).

-2-

ئەوەی کە وای لێکردم لە عەسری یەکێك لە رۆژە باراناوییەکاندا رووبکەمە نێو کۆڵانێکی ئەو گەڕەکە دێرینە، نووسراوێکی سەر لافیتەیەکی رەنگ پەمەیی بوو. هەر لەبەرەبەیانی ئەو رۆژەدا دوو کچۆڵەی چاو سەوزی باڵابەرز بەرامبەر ئەو دوکانەی کە کارم تێدا دەکرد هەڵیانواسی، لەسەری نووسرابوو:

(لەمرۆدا دەیان تابلۆی دێرینی سەیرو سەمەرەترین هونەرمەندە شێوەکارەکانی دنیا لە یەکێك لە کۆڵانەکانی نێو گەڕەکی ئینگلیزەکاندا دەفرۆشرێت).

هێندەم روانییە لافیتەکە خاوەنی ئەو دوکانەی کارم تێدا دەکرد کە ژنێکی ئەرمەنی بوو، دەمێك ساڵیش بوو ئەو دوکانی تەیروتیوور فرۆشتنەی لە شوێنێکی لاچەپەکی شاری شۆلۆ_دا کڕیبوو، بەدەنگێکی هێمن و لەسەرەخۆ بانگی کردم و بەئینگلیزییەکی شێوە جیاواز لە ریتمی ئینگلیزی گوتی:

(هەرچەندە هێشتاکە زووە بەڵام دەتوانیت هەر ئێستاکە برۆیت، ئەگەر چاوەڕێش دەکەیت ئەوە وەك هەموو رۆژێك لە سەعات دوودا کارت تەواو دەبێت).

ئیدی چونکە زۆر کەم دەیدواندم و بەدرێژایی ئەو ماوەیەش کە لای دەستبەکاربووبووم، بێجگە لە وشە فەرمانئامێزەکانی کەدەبوو بێ هیچ وەڵام و خۆماتەڵکردنێك دەستبەجێ بەئەنجامی بگەیەنم و هەمووشی پەیوەستبوو بەچۆنیەتی مامەڵەکردنم لەگەڵ ئەو مەلە دەگمەنەنانەی کە پێشتر لە هیچ شوێنێکی تردا نەمدیتبوو، گوێم لە هیچ شتێکی تری نەبووبوو، هەر بۆیە ئەوەی کەپێی گوتم هێندە سەیر بوو بەلامەوە کەبەدەر لەدەسەلات و ئیرادەی خۆم، هەموو ئەوەی لەبیر بردمەوە کەپیرەپیاوە هیندییەکە پێی گوتبووم.

هەر لەعەسری ئەو رۆژەشدا بەبێ هیچ گرفتێك و هەروەك کەسێکی بەڵەدو شارەزا بەبێ ئەوەی بەهیچ شوێنێکی نێو گەڕەکەکەدا رەت ببم، گەیشتمە نێو کۆڵانەکە، بەڵام هێشتاکە هیچ تابلۆیەکی تێدا دانەنرابوو، ئیدی بۆ ساتەوەختێك دوودڵ بووم لەوەی کە تۆ بڵێی ئەمە ئەو کۆڵانە بێت کە دەبا تابلۆکانی تێدا فرۆشرابا؟!

خەریکبوو لە دەرگای کراوەی یەکێك لەماڵەکانی نێو کۆڵانەکە بچمە ژوورێ تا کەسێك ببینمەوەو پرسیاری لێبکەم، بەڵام وەك ئەوەی لەناکاو سەرابێك ببینم، کاتێکم زانی لەبەشی سەرەوەی

کۆڵانەکەدا چەندان کەس دەڕواننە تابلۆ هەڵپەسێراوەکانی هەردوو بەری دیواری نێو کۆڵانەکە، رووناکییەکی نائاسایی لەوێڕا دەهات، بێجگە لە من هەموو ئەوانەی لەوێدا بوون پرچ و ردێنیان درێژ بوو،چاویان نووری لێدەباری، قامکەکانیان درێژو بالاّ کەڵەگەت بوون. وەك ئەوەی رۆژێکی زۆر سارد بێت کە دەدوان هالاّو لەدەمیان دەهاتە دەرێ کە لێیان نزیك بوومەوە هەستم بەوە کرد کە دەنگیان لێوە نایەت و تەنها لێویان دەبزوێت. پێدەچوو بە قەبارەو چەشن و شێوەی ئەو هالاّوەی کە لە زاریانڕا دەهاتە دەرێ، لە هەموو ئەوە حاڵی بن کە پەیتا پەیتا بە یەکدییان دەگوت.

نەمدەزانی بۆ دەبێت لەژێر باراندا و لەم کۆڵانەدا ئەم بازاڕەیان سازدابێت، پێشم وانەبوو مشتوومڕەکەیان دەرهەق بە تابلۆکان بێت، چونکە نەدەیانڕوانییە تابلۆکان و نەلێشی نزیکدەبوونەوە، هەروەك ئەوەی لە پانتاییەکانی شوێن و زەمەنێکی تردا راوەستابێتن.

پاش ئەوەی سەرپێیی سەیری چەند تابلۆیەکم کرد کە هەر هەمووی دیمەنی شەپۆلە هەڵکشاوەکانی یەك دەریا بوون، هەر لە خۆمەوە چوومە بەردەم گچکە تابلۆیەك کە سەرەتا بێجگە لە چەند رەنگێکی تێکەڵ و پێکەڵ هیچی ترم تێدا نەبینی، بەلاّم پاش کەمێك تێڕامان، هێدی هێدی وێنەکە لە بەرچاومدا روون بۆوەو سەرسامی کردم.

دەتگوت رایەڵێکی نهێنی و پەنهان، من و وێنەی تابلۆکە پێکەوە گرێدەدات، هەرچەندە تا ئەو ساتەوەختەش هیچ یادەوەرییەکی خۆمم وەبیر نەهاتبۆوە، بەلاّم پێدەچوو من لە شوێنێکی ئەو تابلۆیەدا بم، یان ئەو لەشوێنێکی یادەوەرییە سڕدراوەکانی مندا شوێن جێگەیەکی هەبووبێت. هونەرمەندە شێوەکارەکە هەوڵی وێنەکردنی سێبەری سەگێکی شەکەت و ماندووی دابوو کە پێدەچوو بە مەبەستێك وێنەی سەگە راستەقینەکەو سێبەرەکەی لێك جیا نەکردبێتەوە.

کەلێی ورد دەبوویتەوە پێتوابوو بە قوڕاوی کۆڵانە رۆژهەلاّتییەکان رەنگکراوە، بێجگە لە چاوە شینەکانی کە دەچۆوە سەر سولالەی سەگە سیبرییەکان سەرتاپای قوڕاوی بوو، لە هەمووشی سەیرتر ئەو پەڵە ژەنگاوییەی سەر جەستەی بوو، کە بەپێی هەڵکشانی زەمەن شوێنجێگەکەی دەگۆڕدرا.

–3–

تابلۆکە بەو مەرکانە ئاوە دەچوو کە لە رۆژگارێکی زۆر دێریندا کچۆڵەیەك بەبێ گوێدانە قسەی باوانی و بە ئەنقەست رۆیکردبووە نێو ئەو بیرە وشکەوەبۆوەی کە سالاّنێك بوو دەیان عیفریتی تێدا نێژرابوو، هێندەش بەس بوو بۆ زیندووبوونەوەی عیفریتە مردووەکان.

لەبەردەم تابلۆکەدا تێکەڵەو پێکەڵەی چەندەها یادەوەریم وەبیردەهاتەوە، پێدەچوو وەك پیرەمێردی ئەوانگەلەکان مەبەستی بێت سواری کۆڵم ببێت و دەربازبوونم بکاتە مەحاڵ.. تازە ئەگەر لەوێش هەڵهاتبام دەیان دەرکە لەنێوەوەی زەینمدا ئاوەلاّ بووبوون.

سەبارەت بە کتێبی گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکانی شار دوا گوتەی دکتۆرەکەم بیرکەوتەوە، چەندم لەخۆم کرد ئەو کتێبەم وەبیرنەدەهاتەوە کە بەپێی قسەکانی ئەو بووبووە مایەی تێکچوونم. نەدەکرا کتێبێکی وا سەبارەت بە گۆرانیبێژەکانی شارێك نووسرابێت کە نەك هەر بەدرێژایی مێژووی چەند سەد

سالّەی گۆرانیبێژێکی تێدا هەڵنەکەوتبوو، بەڵکو سەرجەم خەڵکەکەشی هەر بە زگماك دەنگیان ناخۆش بوو، ریتمی ناقۆلاّبوونی دەنگیشیان بەپێی وەرزەکانی سالّ دەگۆڕدرا، گەرچی بەشێوەیەکی گشتی دەنگیان بە دەنگی بەربوونەوەی جامە مسێکی دەست کەیبانوویەك دەچوو، بەتاییەت لەو کاتانەدا کە بەر عەردێکی کاشیکراو دەکەوێت.

خەڵکەکە لەنێو خۆیاندا کەپێکەوە دەدوان نەشازێکیان لە دەنگی یەکتردا نەدەبینییەوە، بەلاّم کە دەچوونە دەرەوەی سنوورەکانی شارەکەیان و گوێیان لە دەنگی خەڵکانی تر دەبوو بە خۆیاندا دەشکانەوەو مەگەر زۆر بەناچاری چەند وشەیەکیان لەدەم هاتبایەتە دەر، ئەگینا هەروەك ئەوەی کەلاّڵ بن تەنها بە ئاماژەو جووڵەجووڵ و سەرلەقاندن، گوزارشتیان لەوە دەکرد کە دەیانویست بیلّێن. مندالاّن دەنگیان وەك دەنگی هەر مندالّێکی ئاسایی بوو، ئەو گۆڕانە لە هەرزەکارییەوە روویدەداو تا مردن لە خەڵکی شارەکە نەدەبۆوە.

وەك لەو ساتەوەختەدا وەبیرم دەهاتەوە داپیرەم چەند جارێك هۆکاری ئەو دەنگ ناخۆشبوونەی خەڵکی شاری لە میانی حیکایەتێکەوە بۆ گێڕابوومەوە، هەرچەندە ئەو دەمە کەهێشتاکە توانای گێڕانەوەی حیکایەتی هەبوو، من زۆر مندالّبووم و بەوپێیەش نەدەبا بەباشی لەحیکایەتەکەی حالّی بووبام، جا چ جای لەبیر نەچوونەوەی. هەر ئەو حیکایەتەش بوو کە پاش مردنی داپیرەم بە قەلّەمێکی سوور لەسەر کارتۆنێکی زەردو بەخەتێکی جوان نووسیمەوەو لەپالّ کارتۆنە هەڵواسراوەکانی تری دیواری پشتەوەی ژوورەکەی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان هەڵمواسی.

ئیدی ئەو کارەم بەڕێوەبەری زۆر تووڕەکردو هێندەی لێدام تا لە هۆش خۆم چووم، بەلاّم نەئەو کاتەو نە ئێستاش لەوە حالّی نەبووم، بۆ دەبێت نووسینەوەو هەڵواسینی ئەو حیکایەتە ئاساییەی کە هەموو خەڵك دەیزانی هێندە بەڕێوەبەری تووڕە کردبێت، لەکاتێکدا هەموو ئەو قوتابییانەی کە حیکایەتیان دەزانی بێ پرسکردن لەسەر پارچە کارتۆنێك دەیاننووسییەوەو هەڵیاندەواسی، چونکە بەڕێوەبەر هەر بۆ خۆی چەند جارێك داوای لێکردبووین کە هەر حیکایەت و بەسەرهاتێك کە بەخەیالّماندا دێت یان پێشتر بیستوومانەو دەیزانین بینووسینەوەو هەڵیبواسین.

لەو کاتەدا کە لەبەردەم تابلۆکەدا راوەستابووم، دەنگی داپیرەم دەهاتە گویێ کە دەیگوت:

( لە رۆژگارێکدا پیرەمەنسوور بەمەبەستی سەردانی زاتێکی موبارەکی ئەو سەردەمە باخچە فراوانەکەی خۆی جێدەهێلّیت کە دەکەوتە نێوەندی گەڕەکی مەلەکای ئێستاوە..پاش چەند هەفتەیەك دەگەڕێتەوەو پێش ئەوەی بچێتە نێو باخچە دلّگیرەکەی هەر بەسەرو سیمای خەڵکی گەڕەکەکەدا دەزانێت شتێك روویداوە، بە شپرزرییەوە دەپرسێت:

"چییە..چی روویداوە؟!".

کچۆلّەیەکی جحێل پاش ئەوەی دەستی پیر ماچ دەکات، دەلّێت:

"قوربان گەرچی بێ پسانەوەو بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە جەنابتان لە سەفەربوون کوڕیژگەکانی گەڕەکەکەمان بێ پشوودان و وچان پاسی باخچەکەتیان کردووە، بەلاّم پێدەچێت لە غەیبەوە کەسێك هاتبێتە نێو باخچەکەو سەرجەم گەلاّکانی درەختە پیرۆزەکەی وەراندبێ".

پیر دەزانێت ئیدی ئەو درەختە گەڵا دەرناکاتەوەو لەبنڕا وشك دەبێت و دەمرێت، چونكە هەوەڵین و دواهەمین گەڵای هەر ئەوە بووە کەپێش ئەم حاڵەی ئێستای پێوەی بووە. سەرباری ئەوەی ئەگەر دەستێك لە غەیبەوە بگاتە ئەو درەختە، ئیدی دەرکەی بەڵاو موسیبەتێکی گەورەیان لێ واڵا دەبێت.

پیرەمەنسوور لە حەژمەتا نازانێت چی بکات و دەڵێت:

"ئێستا چی بکەم؟ دەترسم لەمەودوا تۆفان و لافاو بتانبات، کچانتان دەرپێداکەندن بکەنە هونەرو پیاوانی بێگانە سواری خۆیان بکەن.. دەترسم ژنانتان رەدوو بکەون، گەورە پیاوانی شارتان فێرە خیانەت ببن و هەردەمەی داگیرکەرێك بهێننە نێو شارەکەتانەوە..دەترسم پیاوچاکانتان پشتاوپشت سواری گوێدرێژ بکرێن و کۆڵان بە کۆڵان بگێڕدرێن و خۆڵ و دۆ بەسەریاندا بکرێت".

ئیدی گریانی پیرەژنان و پاڕانەوەی ریشسپییان و هاتوهاوارو فوغانی بێخەتایان، وا لە پیرەمەنسوور دەکات بڵێت:

"تەنها یەك چارەتان هەیە ئەویش ئەوەیە کە بۆخۆتان دەردو بەڵاو موسیبەتێك هەڵبژێرن، تا هەموو ئەوەی کە گوتم پێکەوە روو نەدەن".

پاش مشتومڕو بگرەو بەردەیەکی زۆر لەسەر بێزیانترین دەردێك رێکدەکەون کە ئەویش ناسازبوون و ناخۆشبوونی دەنگیانە، هەر بۆیە پیرەمەنسوور فەقیانە سپییەکانی بەردەداتەوەو دەستەکانی رووەو ئاسمان بەرز دەکاتەوەو بەدەنگێکی پڕ لە پاڕانەوەو ترسەوە دەڵێت:

"ئەی شاهی شاهان، سوڵتانی سەر عەرشی کەون و کائینات".

وەك دەگێڕنەوە پیر لەوە زیاتر ناڵێت و ئاوڕێك لە حەشامەتەکەی پشت خۆی دەداتەوەو بەبێ ئەوەی تەنها یەك وشەشی لەدەم بێتە دەر، خەڵکەکە لە مەبەستی حاڵی دەبن و سەرەتا یەك دوویەکیان لە مابەینی خۆیاندا دەدوێن، پاشان ئەوانەی ترو دەبینن دەنگیان بۆتە شتێکی هێجگار ناخۆش و لەو کاتەدا هەر هەموویان پێکەوە بێدەنگ دەبن).

–4–

نەمدەزانی بۆ دەبێت وا بەسانایی بڕوانمە ئەو تابلۆیەی کە تا دەهات زیاتر بەرەو خۆی رایدەکێشام و نغرۆی نێو دەریایەك لە یادەوەریی دەکردم، کەدەبوو بە هیچ وەبیرم نەهاتبایەتەوە. رەنگە هۆکارەکەی ئەو پێوەندییە دێرینەم بێت لەگەڵ دنیای تابلۆو رەنگ و شێوەکاری کە لە میانی خۆشویستنی ژینا_ی کچە دراوسێمانەوە بوو بووە بەشێکی جیانەکراوەی خولیاکانم. ئەو دەمەی لەبەشی شێوەکاریی هونەرەجوانەکان قوتابی بوو، شێتانە وێنەی هەموو شتێکی بەو شێوەیە دەکێشا کە خۆی دەیبینی. هێندەی دەرفەتی بۆ دەرەخسا لەرێی دەروازەیەکی مابەینی خانووەکەمانەوە، پاش ئەوەی بەنێو باخچە چڕوپڕەکەماندا تێپەڕدەبوو، دەهاتە نێو ئەو ژوورەی کە بێجگە لە دەیان کتێبی لەسەر عەرد کەڵەکە بوو، مێزو کورسییەك و سیسەمێکی خەوتن و تابلۆکانی ئەو کە بەزۆر شوێنی دیوارەکەدا هەڵمواسیبوون هیچی تری تێدا نەبوو.

من وەك خۆم تاقانەی دایکێکی بێوەژن بووم، کە دوای هەفتەیەك لە مەرگی باوکم لەسەر چەرپا

بەرزەکەی ژوورەکەی خۆیان راکشاو ئیدی پاش چەند سەعاتێك بەوەمزانی کەدەست و قاچێکی لەکارکەوتووەو ئیفلیج بووە.

ژیانم لە مابەینی خزمەتکردنی دایکێکی ئیفلیج و خوێندنەوەو ماجەراکانم لەگەڵ ژینا_دا، بە بازنەیەکی داخراو دەچوو کەنەمدەتوانی و نەمدەویست لێی بچمە دەر. باوکی شۆفێری ترێلە بارهەڵگرەکانی رێگەی دوور بوو، کە بە مانگیش رێی نەدەکەوتە ماڵێ و کە دەهاتیشەوە تەنها چەند رۆژێك دەمایەوەو وەك هەمیشە رێگەی دووری سەفەری دەگرتەوەبەر.

وەك بۆی دەگێرامەوە دایکی لەگەڵ کابرایەکی زرتەبۆزی میسریدا دەستی تێکەڵکردووە کە زوو زوو بەناوی چاککردنەوەی ئامێرە کارەباییەکان دێتە ماڵیان.

لەرۆژێکدا، بەبۆنەی ساڵرۆژی یەکێك لە یادەوەرییەکانی حزبی بەعسەوە ئاهەنگێك لە گۆرەپانی پەیمانگای هونەرە جوانەکاندا سازدەکرێت و بە فەرمانی بەرێوەبەری پەیمانگەو لیژنەی ئیداری سەرجەم قوتابیان لەگۆرەپانەکاندا کۆدەبنەوە.پاش وتارێکی دووردرێژی بەرێوەبەرو پێداهەڵدانێکی ئێکسترای بە حزبی بەعسدا، وەك هەمیشە مامۆستا کەمانچەژەنە ناسراوەکە دێتە بەردەم مایکرۆفۆنەکەو پاش مەدح و سەنای سەیدولرەئیس و حزبەکەی بەجۆش و خرۆشەوە ئاوازی گۆرانیی زێرە دەژەنێت و چەند گۆرانیبێژێکی مێینەش کە لەشارێکی ترەوە هێناویانن لە دوویەوە دەنگی لێ بەرزدەکەنەوە. لەو کاتەدا بایەکی نەیار هەڵدەکات و قژە ماش و برنجییەکەی مامۆستای کەمانچەژەن دەژاکێنێت و لاپەرەکانی بەردەمی کە لەسەر ستاندێك راگیرکراوە بەحەوادا دەبات.لەم کەین و بەینەدا ژینا خۆی دەدزێتەوەو رێگەی ماڵەوە دەگرێتە بەر..بەدەنگی هەموو ئەو بڵندگۆیانەی کە پەیتا پەیتا گۆرانیی زێرەو پۆلارێزە دووبارە دەکەنەوەو لە هەموو سوچ و پەنایەکی کۆڵانەکانەوە دەنگیان دێت، ورِوکاس دەبێت. لەنێو ئەو ژاوەژاوەدا دەگاتە بەردەم دەرکەی ماڵەوەیان و پاش ئیستێك یەك لەدوای یەك هەموو دەرگا داخراوەکانی ماڵەوەیان دەکاتەوەو تا ژووری خەوتنی دایك و باوکی راناوەستێت..لەوێدا کابرا میسرییەکە بەرووت و قووتی بەسەر دایکییەوە دەبینێ کەلەگەرمەی تەکانداندایە.. بەلام ئاخ و ئۆف و وەیش وەیشی دایکی لەنێو دەنگ و سەدای بەرزی بڵندگۆکاندا بەحاڵ دەبیستێ.

لەو رۆژەدا کە هاتە لام فرمێسك بە چاوە سەوزەکانیدا دەهاتە خوارێ و پاش گێرانەوەی چەند جارەی ئەوەی کەبینیبووی، لەپرِ بەچۆکدا هات و بە ریتمێك کە پارانەوەم تێدا دەبینییەوە، داوای ئەوەی لێکردم ئەو شتەی لەگەڵدا بکەم کە لە دایکی کراوە. زۆرم بەلاوە سەیر بوو، چونکە تا ئەو کاتەش گەرچی زۆر جاران بەرووتیش لەباوەشی یەکتردا خەوتبووین، بەلام بیرمان لە شتێکی وا نەکردبۆوە، زیاتر چێژمان لە ماچ و مووچ و دەستەملانێ و تەپاوتلی نێو جێگا دەبینی.. هەندێ جاریش دەیکردمە مۆدێل و پاش ئەوەی رووتی دەکرمەوە، لەسەر تاکە کورسییەکی نێو ژوورەکەم دادەنیشت و جیا جیا سکێچی بۆ هەر بەشێکی لەشم دەکرد، بە تایبەتیش ئەو بەشانەی کە دەماری هەڵئەوساویان تێدا بوو، لەهەمووشی سەیرتر ئەو چەند سکێچە بوو کە بۆ ئەندامی نێرینەمی کردبوو، بە چەشنێك شێواندبووی کە بۆ خۆشم باوەرِم نەدەکرد کە ئەوە ئەو بێت.

هێندەی نەبرد دوگمەی کراسەکەی ترازاندو سوتیانەکەی زۆر بە هێمنی لەدواوەڕا کردەوە، مەمکەکانی لە چاو جارەکانی تردا، کەمێك گەورەتر هاتە پێش چاوم، کە هێشتاکە شوێن مۆربوونەوەی ماچ و مژینی جاری پێشوومی پێوە دیاربوو.

دواتر زریزەی تەنوورە کورتەکەی بەری کردەوەو پاش کەمێك دەرپێ گولگولێنە تەنکە پەمەییەکەی هێنایە خوارێ و بەپەلە هاتە ژێر ئەو پەتۆ تەنکە رەنگ قرمزییەی کە لە ژێریدا راکشابووم.

نەمدەزانی بۆ لە ئێستادا ئەوەم وەبیرنایەتەوە کە ئاخۆ ئەوەی بۆ خۆی لێی داواکردم، کردم یان نا؟!

–5–

درەخت و گوڵ و رووەکە سەیرو عەجایبەکانی نێو باخچەکەی چواردەوری خانووەکەمان، باوکم پێش مردنی پاش ئەوەی کە لە دوورترین سەفەرێکی گەڕایەوە لەگەڵ خۆی هێنابوونی.

سەرەتا هەموو ئەوانەی باوکمیان دەناسی قەناعەتیان بەوە نەبوو هیچ کام لە نەمامی ئەو درەختە سەیرانە لە گڵەسووردا رەگدابکوتن و سەوز ببن، ئەمە بێجگە لەوەی کە سوێندیان بۆ دەخواردو دەیانگوت:

( مادامەکی ئەمانە هەموویان دارودرەختی وڵاتی گەرمن، مەحاڵەلەبەردەم ساردوسڕیی زستانی ئەم شارەو رەشەباکەیدا خۆیان رابگرن).

ئیدی موعجیزەکە لەوەدا بوو، ئەو درەختانەی کەساڵێك بوو روێنرابوون و سەوز نەبووبوون. پاش مەرگی باوکم لەو پاییزەدا هەر لە خۆیانەوە گەڵایان کرد، تەنانەت دوای ئەوەش بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گەشەیان کردو هێندەیان لك و پۆپ دەرکردو پەل و پۆیان هاویشت، هەموو رێگەیەکی هاتنە ناوەوەی خۆرەتاویان بۆ نێو ماڵەکەمان بڕی و کردیانە کڵێسەیەکی شێداری نێو حیکایەتەکان. ئەمە بێجگە لەوەی کە رووەکە بە چنگە سەرسەختەکان هەموو دیوارو سەربان و هەورەبان و سوچ و پەنایەکی ماڵەکەیان تەنی بوو..ئیدی دنیایەکی جوداو جیاواز لە هەموو ئەو دار و درەخت و رووەکە سەیرو سەمەرانە دروست بوو بوو.

شەوگەردی قەبارە گەورەی نا ئاسایی لەنێو رووەکە بەچنگەکاندا خۆیان مەڵاسدەدا، مێش و مێشولەو هەموو چەشنە مێرووەکانی تریش سەر بە دنیای نێو درەختانی شار نەبوون، پێدەچوو لەگەڵ درەختەکانی باوکم لەو کیشوەرە دوورەوە هاتبێتن.

هەر کاتێك کە ژینا دەهاتە لام سەرەتا بۆنی گوڵە سوورەکانی ئەو رووەکە هەمیشە سەوزەی دەکرد کە هەردەم بەدەر لە کاریگەریی کەشوهەوا و وەرزەکان ژمارەیەکی نەگۆڕ لە گوڵ و خونچەی پێوە بوو، هەر کە پڕ سییەکانی بۆنی بە گوڵەکانەوە دەکرد مەست و گێژ دەبوو، ماوەیەك بە چیچکانەوە بۆی دادەنیشت و نەیدەوێرا هەڵسێتە سەرپێ نەبادا لاقەکانی تێکبئاڵێن و بکەوێت.

زەمەن لەژێر ئەو هەموو دارو درەختەدا بە زەمەنی ئاسایی نەدەچوو، زۆر بە هێواشی دەچووە

پێش و لەوێدا هەموو شتێکت لەبیردەکردو بەڕاستی پێت وابوو لە کیشوەرێکی تردا دەژیت و دەنگ و سەدای دنیایەکی ترت دەهاتە گوێ، چاوت لە رەنگ و تارماییەکانی پانتاییەکی جوگرافیی تر دەبوو. هەر بۆیە من و ئەو لە ژێر قورسایی سێبەری ئەو هەموو درەختەدا دەبووینە دوو بوونەوەری تر، دوو بوونەوەری رەنگ و شێوە جیاواز..رەنگە لە دەرەوەی ئەو پانتاییەدا هەردووکمان دوو مەخلوقی تر بووینایە، بۆنێکی جیاوازترمان لێ بهاتایە لەکاتێکدا لەوێدا بۆنمان بە بۆنی هەموو شتێکی نێو ئەو باخچەیە دەچوو کە زۆرجار دەگەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە رەنگە لەراستیدا نەبێت و تەنها خەیاڵ و تەسەوری هەردووکمان چێی کردبێت. لەوێدا شێتانە حەزمان لەیەکتر دەکرد، شێتانە لە یەکترمان دەڕوانی، شێتانە بیرمان لە دەنگی ناقۆڵای خۆمان و هەموو ئەو خەڵکە نەفرەتلێکراوەی ئەو شارە دەکردەوە.

**-6-**

هێشتاکە لە تابلۆکەم دەڕوانی و چاوم بۆ یەکێك دەگێڕا کە لەو نزیکانەوە وەستابێت و شتێکی لێ بپرسم، هەر چییەکم کرد زاتی ئەوەم نەکرد لە هیچ کامێك لەوانە نزیك ببمەوە کە تەنها بە هاڵاوی دەمیان لە یەکتر حاڵی دەبوون.

نوشتامەوەو لەوەدابوو دەست بدەمە تابلۆکە، کاتێکم زانی قاچ و قوولێکی سفت و سپی و بێ موو لە نزیکمەوە راوەستا، کە سەرم هەڵبڕی سەرەتا تەنوورە رەشە کورتەکەی سەرنجی راکێشام کە بستێك لە نێو قەدییەوە هاتبووە خوارێ، تیشۆرتە پەمەییەکەی بەری هێندە تەنك بوو گۆی مەمکە قووتە بەرەڵاکانی بەئاسانی دەبیندران، بەچەشنێك کە سەرسامی دەکردیت.. ملوانکەیەکی لە هێلکە شەیتانۆکە دروستکراوی لەمل کردبوو، خاچێك لە نێوەڕاستییەوە هاتبووە خوارێ، گەردنە بەرزو رووکارە ئاڵە مەیلەو زەردەکەی درەوشانەوەیەکی سیحراوییانەی هەبوو..رەنگی چاوەسەوزە کەمێك تەڵخەکانی بە رەنگی ئەو دەریایە دەچوو کە لەساتەوەختێکدا پەڵە هەورێك دەیەوێت شتێك رەنگە ئاساییەکەی تێکبدات.

نەدەکرا لەو کاتەدا ژینا_م وەبیر نەکەوێتەوە، کە بەشێوە شتێکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو کچۆڵەیەدا فەرق نەبوو..ئەوەی بەلاشمەوە سەیربوو، تا ئەو ساتەوەختەش هێشتاکە یادەوەرییەکانی پاش ئەو دەمەی کە هەردووکمان لەژێر پەتۆ قرمزییەکەدا راکشابووین، وەبیر نەدەهاتەوە.

دوای ئەوەی دەستی دایە تابلۆکەو هەڵیگرت، چەند هەنگاوێك دوورکەوتەوەو لەپڕ لەشوێن خۆیدا راوەستاو ئاوڕێکی لێدامەوەو بە ئاماژەیەك تێیگەیاندم کە دەبێت وەدووی بکەوم.

بارانەکە بێ کەم و زیاد هەروەك خۆی دەباری..سەرنجی پێڵاوە پاژنە بەرزەکانیمدا لە رۆیشتندا دەنگێکی زۆر دڵگیریان هەبوو، دەنگی ریتمی رۆیشتنی و بارینی بارانەکە زۆر بەیەك دەچوون، لەو کاتەدا خۆم وەك گوڵە سەگێك دەهاتە پێش چاو کەدوای دێڵە سەگێك کەوتبێت..بۆنی هەموو شوێنێکی جەستەیم دەکرد، لە هەمووشی خۆشتر ئەو بۆنە بوو کە لە مەمکۆڵانییەوە دەهات، بۆن و نمەی باران و دەنگی پێی کەشێکی سەیریان بۆ خولقاندبووم کەدەمێك بوو لێی بێبەش بووم..بیرم

لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەبێت پەنجەکانم چییان لێ بەسەر بێت ئەگەر بگەنە ژێر تیشۆرتە تەنکەکەی بەری و بەر گۆی مەمکەکانی بکەون؟! دەبێت لێوەکانم چەند رەنگ بگۆڕن ئەو دەمەی دەگەنە گەردن و رووومەت و لێوەکانی؟..سمت و کەفەڵی هێندە تورت و هەڵئاوساو بوون حەزو ئارەزووییەکی هەرزەکارانە بەنێو دەمارەکانمدا دەگوزەراو دەتگوت لە دنیایەکی تردام، یان لە خەونێکی قوڵدام و شەیتان خۆی لێکردوومەتە شیرینترین مێینەو تا شەیتانی نەبم دەستبەردارم نەبێت و ئێخەم بەرنەدات.

بەنێو باریکە کۆڵانێکی دوورودرێژی پاك و خاوێندا رۆیشتین و هێندەی نەبرد لە دەرکەی کراوەی خانوویەکەوە چووە ژوورێ، کە پانیی حەوشەکەی پێنج مەترێك دەبوو، وەدووی کەوتم تا ئەو دەمەی دەرگایەکی تریشی کردەوەو چووە ژوورێ..ئیدی لە ئاستانەی دەرگاکەدا قەدەرێك راوەستام، بەڵام پاش ئەوەی هیچ دەنگی نەبوو بەکاوەخۆ چوومە ژوورێ و لەسەر قەنەفەیەکی پان و پۆڕی رەنگ قاوەیی دانیشتم کە هەر بەجێگەی خەوتن دەچوو. ژوورەکە رێکخراو و پوخت بوو، دەیان شتی ئەنتیکاو تابلۆی بەنرخ بە دیوارەکانییەوە هەڵواسرابوو، ئەو تابلۆیەی کەیەکسەر سەرنجی راکێشام وێنەی راوچییەك بوو کە بە رمەکەی کارمامزێکی پێکابوو، بەڵام هێشتاکە لەسەر لاقان راوەستابوو..بە منداڵیش کەلەگەڵ باوکمدا چووبوومە دوکانی بلەی عەلاف، تابلۆیەکی لەو چەشنەم بەرچاوکەوتبوو، بەڵام لەجێی کارمامزەکە پڵنگێك بوو کە لەحاڵەتی شالآوبردندا راوچییەکە رمەکەی لەسەر سنگی چەقاندبوو..بۆ رۆژی دوایش زۆرم لە باوکم کرد تا بمباتەوە بۆ دوکانەکەی بلەی عەلاف، وامدەزانی دیمەنێکی ترم دێتە پێش چاو و هەر لەخۆمەوە لایەنگری پڵنگەکە بووم و لەبەرخۆمەوە دەمگوت:

(پڵنگ ئازایە..بەنووکە رمێك هیچی لێ نایەت..هەر دەبێت تۆڵەی خۆی لە راوچییەکە بکاتەوەو بیکوژێت).

زۆر بەوردی سەیری چەند تابلۆیەکی تری ژوورەکەم کردو هیچم تێدا نەبینییەوە..لەناکاو تابلۆیەکی لێکچووی هەمان تابلۆی سێبەری سەگەکەم بینی، بەڵام کە زیاتر لێی وردبوومەوە پەیکەری تێکشکاوی کەشتییەکی کەنار دەریایەکم کەوتە بەرچاو کە لە باکگراوندی نێو قووڵایی تابلۆکە جێهێڵڕابوو، سێبەری سەگەکەش لە سێبەری سەگی تابلۆکەی تر زیاتر پەشۆکاو و شپرزە بوو، لەوەش نەدەچوو چاوە شینەکانی تین و گوڕی تێڕوانینیان تێدا مابێت.

-7-

گچکە باڵندەیەکی دەنووك بچکۆلەی مەیلەو زەرد لە دەرگاکەوە هاتە نێو ژوورەکەو پاش کەمێك باڵەفڕە لەسەر رووەکێکی نێو ئینجانەیەکی سووچێکی ژوورەکە هەڵنیشت.. دوو کچ لەو دەرگایەوە هاتنە دەرێ کە پێشتر کچەکەی تری پێدا چووبووە ژوورێ.

پرچ زەردەکەیان بە سەرسامییەوە سەرنجی دام و پاش هەڵوێستەکردنێکی کەمخایەن، ئاگام لێبوو بەوەی تریانی گوت:

(خۆ نامناسێتەوە).

نەمزانی چۆن لە ژوورەکە هاتمە دەرێ و وەدوویانکەوتم، هێشتاکە لە هەمان ساتەوەختی عەسری ئەو ڕۆژەدا بووین و پێدەچوو زەمەن لەو ئاستەدا راوەستابێت. لەرێگا کچە پرچ زەردەکەیان چووە لای کابرایەکی زرتەزەلامی رەشتاڵە کەلەسەر کورسییەکی تەختە دانیشتبوو، بێباکانە و زۆر بە قووڵی مژی لە ئاغزی نێرگەلەکەی نێو لەپی دەستی دەداو دووکەڵەکەی بەبا دەکرد.

کچەکەی تریان کە ئەسمەرێکی پرچ رەش بوو، لێم نزیك بۆوەو بەگوێمدا چرپاندی:

(مەهێڵە لەو زرتە زەلامە نزیك بێتەوە، تا بڵێی کابرایەکی بەدو بێناموسە، لێرە هەموان باش دەیناسن و دەزانن تەنها ئیشێکی گەوادییە).

گوێم نەدایە قسەکانی و پاش کەمێك هەروەك ئەوەی گەمان بکەین، من کەوتمە پێشیان و ئەوان وەدووم کەوتن. دواتر ئاگام لە چوونە پێش و چەشن و چۆنیەتی هەنگاوەکانم نەما، نغرۆی داڵغەیەکی قووڵ بووم و لەزەینمدا بۆ سەرە هەودایەك دەگەڕام تا لەوێوە بچمە نێو ئەو زەمەنەی کەئەو کچەم تێدا ناسیبوو..کاتێك ویستم هەڵوێستەیەك بکەم و لەشوێن خۆمدا رابوەستم، درکم بەوەکرد کە توومەزە هەر لەهەوەڵەوە لەشوێن خۆمدا راوەستاوم و ئەویش لەبەردەممدا راوەستاوەو تیمدەڕوانێت.

کەچاوم هەڵهێنا تەنها گلێنە سەوزەکانی چاوی سەرنجی راکێشام، هەروەك ئەوەی دەست بۆ وێنەیەك بەرم، ئاوا دەستم بە گلێنەکانی چاویدا هێناو هەر لەخۆمەوە بە نینۆك هەڵمکڕاند، سەیرم کرد رەنگەکەی لێ نابێتەوە.

گوتی:

(من ژینام نامناسیتەوە؟!)

نەدەکرا ئەو بێت، گەرچی هەستم دەکرد ئاشنایەتییەکم لەگەڵی هەیەو شتێك پێکەوەمان گرێ دەدات، بەڵام بێجگە لە چاوە سەوزەکانی هیچ شوێنێکی تری لە ژینا نەدەچوو، دوا وێنەی ژینا لە زەینمدا پەیوەستبوو بەو ساتەوەختەی کە بۆ دواجار هاتە ژێر پەتۆ قرمزییەکەمەوە، لەو رۆژەدا کە پیاوە میسرییەکە خەریکی دایکی بوو. لەناکاو ئەو کچەی کەدەیگوت من ژینا_م دایە پرمەی گریان و باوەشی پێداکردم، نەدەکرا باوەڕ بەوە بهێنم کەئەم ئەو بێت..ئەستەمبوو گەیشتبێتە شاری شۆلۆ..ئەمە جگە لەوەی هیچ لۆژیکێکم لەوەدا نەدەبینییەوە کەلە ئێستادا لەهەمان تەمەنی ئەو دەمەی ژینا_دا بێت.

گوتی:

(ناکرێت منت لەیادکردبێت، وەبیرت دێت لەسەر داوای خۆت تابلۆی سێبەری سەگێکم بۆ کردیت؟ هەردەم پێت دەگوتم سێبەری ئەو سەگە ژیانی لێ هەراسان کردووم و لەهەر کاتێکدا بمەوێت بەختەوەر بم ئەو لە سووچ و پەناو شوێنێکەوە خۆیم پیشان دەدات و بەدەنم ئیفلیج دەکات و رۆژی رووناکم لێ دەکاتە شەوی تار.. بەبیرت دێت ئەو کاتەی کەهێشتاکە منداڵ بوویت دایکت زوو زوو دەیبردیتە سەر پیاوچاکان و موشایەخان تاچاك ببیتەوە.. باشە هەر سێبەری ئەو سەگە نەبووە هۆکاری ئەوەی کە نەچیتە نێو تاقیکردنەوەکانی دواهەمین ساڵت لەبەشی شانۆ و هەر لەبەر ئەویش نەبوو منت لەژێر پەتۆ قرمزییەکەدا بەتەنێ جێهێشت؟).

**-8-**

پاش قسەکانی ئەو کچەی کە دەیگوت من ژینا_م، تەنها چەند شوێنێکی سێبەری سەگەکەم دەبینی کە لەنێو کۆلانێکی گەڕەکە دێرینەکەدا شوێنگۆڕکێی دەکرد. کەبەتەواوی هاتە پێش چاوم و لە پێشمەوە کەوتە ڕێ بەکاوەخۆ وەدووی کەوتم و بردمیە نێو حەمامێکی ڕۆژهەلاتییانە..دوای ئەوەی چووینە نێو گەرمخانەکەی، بینیم سەدان پیرەمێردی بەسالاچوو بە ڕووت و قووتی لەسەر سەکۆ جیاجیاکان دانیشتوون، دەنگی بەردەوام و یەك لەدوای یەکی بەربوونەوەی جامەکانی دەستیان ئیقاعێکی ترسناکی هەبوو.. لەو ساتەوەختەدا ئاگام لە سێبەری سەگەکە نەماو ڕوانیمە ئەو پیرەمێردە جەستە ڕەق و تەقانەی کە ددانێك چییە لەدەمیاندا نەمابوو.. پاش کەمێك لەوە حالی بووم کە هەموو پیرەمێردەکان بەشێوە لەیەکتر دەچن و هەر هەمووشیان بەیەك شێوەی سامناك و سەیر تێم دەڕوانن و دەتگوت دەیانەوێت شتێکم پێ بلێن.

خەریکبوو بچمە دەرێ، کاتێك یەکێکیان گوتی:

(ئێستا حیکایەتخوانەکە دێت و وەك هەموو ڕۆژێك هەمان حیکایەتمان بۆ دەگێڕێتەوە، حەز دەکەین تۆش گوێڕادێری بیت).

ئەوەندەی نەخایاند زرتەبۆزێکی ڕەش ئەسمەر بە ڕووت و قووتی هاتە نێو گەرمخانەکەی حەمامەکەوە، هەر لە هەوەڵەوە زامە قوولەکانی زۆر شوێنی جیاجیای جەستەی سەرنجیان ڕاکێشام.. بەلام سەیر لەوەدا بوو چەقۆ زۆر درێژە نووك تیژەکەی دەستی، هێندەی زامەکانی سەرنجی ڕانەکێشام.

لەسەر سەکۆیەکی نزیك حەوزە گەورەکەی نێوەڕاستی گەرمخانەکە کەهالاوی لێ هەلدەستا دانیشت وگوتی:

( وەك هەموو جارێك کە بۆتان دەگێڕمەوە و پێتان دەلێم من بەرەچەڵەك دەچمەوە سەر نەوەی یەکێك لە فیرعەونە دەنگخۆشەکان کە تەنها فیرعەونێکی گۆرانیبێژی نێو نەسلی فیرعەونەکان بووە.

لەرۆژگارێکدا و پاش بینینی خەونێك کە تا ئێستاش هیچی لێ حالی نەبووم، بڕیارمدا بچمە شاری مەخلوقە دەنگناخۆشەکان، بەسەرهاتی مەخلوقەکانی ئەو شارەشم لە کتێبێکی کۆندا بەرچاوکەوتبوو.

هەر ئەوەندەی گەیشتمە شارەکەو پاش چەند ڕۆژێك لەبەردەم قەسابێکدا نارەنارێکم لەزار هاتە دەرێ و پێم وابوو ڕەنگە خۆشحال بێت و لەوێدا بتوانم گۆرانییەك بلێم..بەلام تووڕەبوونی گەیشتە ڕادەیەك، ئەگەر پیاوەکانی سەیدولرەئیس فریام نەکەوتبان ئەو ڕێك و ڕاست لەپال ئەو ئاژەلانەی کەسەربەرەوخوار بە قولاپەکاندا هەلێواسیبوون هەلێدەواسیم.

دواتر لەوە حالیبووم کەخەلکی شارەکە، بەهەموو دەنگێکی خۆش هستریا دەیانگرێت و حالیان لێ دێت، تەنانەت منداڵەکانیشیان هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوە دەکرد کە هەموو چەشنە باڵندەیەکی دەنگخۆش بکوژن و بۆ ئەمەش چەشنی جۆراوجۆری دارەلاستیك لەو شارەدا دروست دەکرا، خڕکە بەردی نووك تیژیشیان لەقەراغ چەمێکی دوورەوە بۆ کوشتنی باڵندەکان دەهێنا و لە بازاڕدا

دەیانفرۆشت. لەو شارەدا دەستم کرد بەچاککردنی هەموو کەلوپەلێکی کارەبایی نێو ماڵان.. هێدی هێدی لەوە حاڵیبووم کە دەتوانم لەژێر زەمینی ماڵەکاندا گۆرانی بۆ مێینە شەهوەتبازەکانیان بڵێم، ئەو مێینانەی بە بیستنی دەنگم سەرسام دەبوون و بێجگە لەماجەرای حیکایەتەکانی نێو گەڵی پیاوان هیچ شتێکی تریان نەدەزانی و لە هیچ کەشوهەواو وەرزێکیشدا دەرپێیان لەپێ نەدەکرد و هەمیشە رێیان بەهەموو چەشنە بایەکی ساردو گەرم دەدا، بەنێو گەڵە هەڵتاوساوەکانیاندا گوزەر بکات. لەو سەردەمی شەڕو شۆڕو تۆپبارانەدا، بەتایبەت ئەو دەمانەی سەرجەم خەڵکی شار شپرزەی رووداو و کارەساتەکان دەبوون، من لەیەکێك لە ژێر زەمینەکاندا گۆرانیم بۆ مێینەیەك یان چەند مێینەیەکی هاوچەشنی ئەو شارە دەگوت.

لەو کاتانەدا زۆر بەختەوەر بووم، چونکە توانیبووم تۆڕێکی نهێنی بۆ خۆم بچنم و لە پشت دنیای شاری دەنگناخۆشەکانەوە شارێکی تر بنیات بنێم کە پڕبوو لە دەنگی سیحراوی خۆم. مێینەکانی ئەو شارە لێویان بە زەردە توێژاڵێکی تەنکی هەنگوین دەچوو.. نیگاکانیشیان بە پانتایی ئەو بیابانە دەچوو کە موسا لەتاو فیرعەون رووی تێکردبوو. ئیدی رێکەوتێك ئەو دنیایەی پێ جێهێشتم و منی ناردە نێو ئەم دنیایەی کە نەدەکرێت گۆرانیی تێدا بڵێم و نە لێرەشەوە دەنگم بە کەس دەگات، رێکەوتێك بوو کە نەدەبوو روویدات!.

ژنە شۆفێرێکم ناسی و پاش ماوەیەك لە یەکێك لەو رۆژانەی کەخەڵکی شار یادی خۆشترین رۆژێکیان دەکردەوە، چوومە لای و لەوەدابوو وەك هەموو جارێك بچمە ژێرزەمینەکەیان تا لەوێدا گۆرانی بۆ بڵێم، بەڵام گوتی:" لەم ژاوەژاو و هەراو زەنایەدا دنیا لێمان بێخەبەرەو کەسیش گوێی لە دەنگت نابێت، با ئەمڕۆ بچینە ژووری خەوتن و لەوێدا گۆرانییەکانم بۆ بڵێ ".

بەشادمانییەوە لەگەڵیدا چوومە ئەوێ و وەك هەمیشە چۆن لەکاتی گۆرانیگوتندا لەگەڵ مێینەکاندا لێی رادەکشام، بەو چەشنە لێی راکشام و ئەویش لەپاڵمدا راکشاو رەنگە زووربەی ئاوازە سیحراوییەکانی سەردەمی فیرعەونییەکانم بۆ یەکەمجار لەوێدا بۆ ئەو گوتبێت.

پاشان نازانم چی روویدا، رەنگە لەتاو گۆرانیگوتن، لە هۆش خۆم چووبێتم و ئاگام لەخۆم نەمابێت.. بەڵام کە لەم حەمامەی ئێوەدا بەئاگا هاتمەوە، هێشتاکە هەموو زامەکانی جەستەم خوێنیان لێ دەچۆڕا).

-9-

کەلە حەمامەکە چوومە دەرێ سێبەری سەگەکە لەپەنایەکدا چاوەڕێم بوو.. نەمدەزانی دەمباتە چ شوێنێکی تریش، دەبوو سەرجەم یادەوەرییەکانم وەبیربێتەوە، بەڵام وەبیرهاتنەوەی یادەوەرییەکان تا ژێر پەتۆ قرمزییەکە بڕی دەکرد..دەمزانی لە پاش ئەوەشەوە دەیان یادەوەریی تر هەیە و هێشتاکە لە زەینمدا شاردراوەیە، هەستم دەکرد سێبەری سەگەکە لە زۆرشت ئاگادارەو شایەتێکی زیندووی رووداوەکانە.

هەوڵمدا نەخۆشخانە دەروونییەکانی شارەکە بێنمەوە پێش چاوم، بەڵام سەیر لەوەدا بوو بینایەکی

سەربان و سەردیوار تەلبەندکراوم لەبەر چاودا بەرجەستە دەبوو، کەئالآیەك بەسەرییەوە دەشەکایەوە.. چەندم کرد نەمتوانی دکتۆرەکە بە جلی پزیشکییەوە ببینم، وەك ئەفسەرێك دەهاتە پێش چاوم، لەکاتێکدا بریق و باقی ئەستێرەکانی سەرشانی ئاوی چاویان دەبرد.

لێدان و تێهەڵدانی نێو ئەو شوێنەم وەبیر دەکەوتەوە، هەستم بە ئازاری زۆر شوێنی جەستەم دەکرد..قولاپی بنمیچەکەم بیرکەوتەوە کە پاش ئەوەی هەردوو دەستمیان لەپشتڕا کەلەپچە دەکردو قایشێکیشیان تێدەپێچا بەوێدا هەڵیاندەواسیم و وایەرێکی نەرمیان لەسەری زەکەرم دەبەست و پاش هەڵسوڕانێکی خێرای دەسکی ئەو ئامێرەی جەمالی مفەوەزی ئەمن لە ئامێزی خۆی دادەنا، تەزوویەکی پڕ ئازاری بێزارکەر لەو شوێنە هەستیارەوە دەچووە نێو هەناوم و زۆر جار خۆم پێ ڕانەدەگیراو چۆڕە چۆڕ میزی خوێناوی لەکونی چووکمەوە فیچقەی دەکرد.دەنگی خۆم وەبیردەهاتەوە، کە پڕ بەدەم هاوارم دەکرد..وامدەزانی لەنێو ئەو کۆڵانەی کە لەو کاتەدا پێیدا تێپەڕدەبووم، سەدای دەنگی ئەو هاوارەی خۆم دەبیستم. دەمویست بگەڕێمەوە ژێر پەتۆ قرمزییەکەو لەوێوە دەستپێبکەم، لەوێوە سەرەهەودای هەموو ئەو بەسەرهاتە بدۆزمەوە کەدەبوو لە قولآییەکانی زەینمدا خۆی حەشاردابێت.

هێشتاکە لەهەمان ساتەوەختی ئەو عەسرەدا بووم، نەمدەزانی ئەو کۆڵانەی کە تابلۆکانی تێدا دانرابوو، دەکەوێتە چ لایەکی ئەو کۆڵانە فراوانەی کە لەو دەمەدا پێیدا ڕەتدەبووم. گەڕەکەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو کە من تەسەورم کردبوو، پێدەچوو بێکۆتا بتوانیت لە نێویدا هەنگاو بنێیت.

سێبەری سەگەکە لەچەقی کۆڵانەکەدا ڕاوەستاو بە کووچەیەکی کەمێك هەورازدا هەڵگەڕا، وەدووی کەوتم.. هەر کە گەیشتینە بەردەم باخچەیەکی گەورە بازێکی بەسەر پەرژینەکەدا داو چووە ژوورێ، منیش هەروەك ئەوەی کەسەگێك بم زۆر بەئاسانی و بەهەمان شێوە بازم بەسەر پەرژینەکەدا داو چوومە نێو باخچە چڕوپڕەکە. رووەکە بەچنگەکان دیوارو سەربان و هەورەبانی خانووەکەی داپۆشیبوو، شەوگەردێك لە سەروو دەرگای سەرەکیی خانووەکە هەستی راگرتبوو، زووربەی ژوورەکانی نێو خانووەکە چۆڵ و هۆڵ بوون، تەنها لە ژوورێکی لاچەپەکدا کەلوپەلت دەبینی کەکورسی و مێزێك و دەیان تابلۆی هەڵواسراو و بارێك کتێبی کەڵەکەبووی تێدا بوو. لەهەمووشی سەیرتر ئەو سیسەمە بوو کە پەتۆیەکی قرمزیی بەسەردا درابوو کە هەر دەتگوت سیسەمەکەی خۆمە.

یەکێك لە تابلۆ هەڵواسراوەکان وێنەی سێبەری سەگێك بوو کە لە دەرگای ژوورێکەوە دەیڕوانییە دوو جەستەی ڕاکشاوی ژێر پەتۆیەکی قرمزی.

چوومە ژێر پەتۆ قرمزییەکەو بۆ تاوێك بە ڕاکشانەوە لەبنمیچی ژوورەکەم ڕوانی، کەشیّ و دڵۆپەکردنی ساڵآنێکی دووروودرێژ زۆر شوێنی پەڵەپەڵەکردبوو، تێکەڵەیەك بوو لە هارمۆنییەتی ڕەنگ کە دەکرا بە ڕەنگە جیاوازەکانیاندا ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی ئەو ژوورەی پێ بزانیت.

بۆ تاوێك پێڵووەکانم لێکناو هەوڵمدا بیر لە هیچ نەکەمەوە. کەچاوم هەڵهێنا هەر دەتگوت لەو ساتەوەختەی ئەو ڕۆژەدام کە ژینا بۆ دواجار هاتەلام، هێندەی نەبرد هەر بەڕاستی بەهەمان جلوبەرگ و شێوەو ئاکاری ئەو ڕۆژەوە هاتە ژووریّ.. هەمان ئەو شتانەی دووبارە دەکردەوە کە لەو ڕۆژەدا کردبوونی، دواتر هاتە ژێر پەتۆ قرمزییەکەو گوتی:

( دەئێستا ئەوەم لەگەڵدا بکە کە پێم گوتی).

نەدەهاتە بیرم ئاخۆ لەو رۆژەدا ئەوەم لەگەڵدا کردووە کە لێی ویستووم، یاخود..!

هەستامە سەرپێ و تا نەگەیشتمە بەر دەروازەی مابەینی خانووەکەی خۆمان و ئەوان رانەوەستام، سەیرێکی هەموو ئەو درەختانەم کرد کە جیاواز لەو کاتانەی کەبەڕاستی لەنێویدا دەژیام، هیچ سیحرو تەلیسمێکی باخچەکەی جارانیان نەبوو.. گوڵە سوورەکان بۆنیان نەبوو، هەر بەوە دەچوو کەهەموو شتێکی ئەو باخچەیەت لەمادەیەکی بێ گیان دروستکردبێت. چوومە ئەودیوی دەروازەکەو تا ژووری خەوتنی دایك و باوکی ژینا رانەوەستام، زرتە بۆزە میسرییەکە بەسەر دایکی ژیناوە بوو، لەکاتێکدا هەردووکیان خوێن لە زۆر شوێنی جەستەیانەوە دادەچۆڕا، هەروەك ئەوەی دەیان دەست و بە دەیان چەقۆی نووك تیژی زۆر درێژ سەراپای جەستەی ئەو دوانەی بەو حاڵە گەیاندبێت، نەدەچووە ئەقڵمەوە دەستە ناسکەکانی ژینا بووبێتە دەیان دەست و ئەو دوو بوونەوەرەی ئاوا لێکردبێت.

کە بەشپرزەیی گەڕامەوە ژینا لەژێر پەتۆ قرمزییەکەدا دەگریا.. کەهەستی پێکردم سەری بەرزکردەوەو گوتی:

( من نەمکوشتون و ناشزانم کێ کوشتونی!).

نازانم بۆ لەو کاتەدا گوتم:

( بچۆرە مەخفەری پۆلیسی دەستەراستی کۆڵانەکەمان و بڵێ کوڕە شێتەکەی دراوسێمان دایکم و کابرایەکی پێکەوە کوشتووە..بڵێ هەر ئێستا لە پەیمانگە گەڕامەوەو کەچوومە ژووری ئەو بەچەقۆیەکی زۆر درێژی نووك تیژەوە هەڵدەهات).

ئیدی پاش ئەوەی بۆ ماوەی سێ ساڵ ئاگام لە هیچ هەواڵێکی ژینا نەما.. کە لەنەخۆشخانەش هاتمە دەرێ، هێشتاکە نەچووبوومە ماڵێ کە پیرەژنێکی خزمی دایکم لەنێوەڕاستی راستەرێیەکدا بوو بەتووشەوە کە هەمیشە بەپێی پەتی دەگەڕا.. بەبێ هیچ هەواڵپرسین و چەندو چوونێك گوتی:

( پاش ئەوەی تۆ دەستگیرکرایت.. ژینا بەوەی زانیبوو کەدووگیانە، هەر بۆیە بەبێدەنگی خۆی سووتاند..یاخوا دەستت خۆش بێت، بەخوا ئەگەر ئەو میسرییەت نەکوشتایە تائێستا نیوەی کچ و ژنی ئەم شارەی خراپکردبوو!).

پێش ئەوەی پیرەژنەکە جێبهێڵم، بەدەنگێکی پڕ سۆز و بەزەییەوە گوتی:

( کوڕی خۆم باشە بۆ خۆت کابرا میسرییەکەت بەسەر ژیناوە بینی، یان بۆ خۆی بۆی باسکردیت، وەك دەڵێن پاش رابواردنی لەگەڵ دایکی.. ئەویشی سەقەتکردووە!؟).

لەو ساتەوەختە کرچ و کاڵەدا سێبەری سەگەکە وەك عیفریتێك بەسەر سەرمەوە راوەستابوو، هێندە گەورەو زەبەللاح بوو کەپێدەچوو هەموو ژوورەکە سێبەرێکی ئەوبێت.

پێش ئەوەی چاوەکانم لێك بنێم و بۆ دواجار بە پەتۆ قرمزییەکە سەری خۆم دابپۆشم، سێبەری سەگەکە وەك خۆی لێهاتەوە و هێدی هێدی خزایە ژێر پەتۆکەو بەتەواوی خۆی پێوە نووساندم.. هەرگیز بیرم لەوە نەکردبۆوە کە رۆژێك دادێت من لەگەڵ سێبەری سەگێکدا دەخەوم..هەستم بەهانکە هانك و هەناسەی گەرمی دەکرد.. گوێم لە خیزە خیزی سنگی بوو.. پێدەچوو ببێتە بەشێك لەمن و

بێتە ناومەوە، ئەگەر هەر لەبنەڕەتەوە بەشێکی من نەبووبێت و لە زەمەنێکدا وەدەرم نەنابێت!.پاش قەیرێك لەبێدەنگی، بێجگە لە خۆم هیچ کەسێکی تر لەژێر پەتۆ قرمزییەکەدا نەبوو!.

گوێم لەدەنگی لێدانی دڵم بوو بە دەنگی لێدانی دڵی سەگێك دەچوو.. سەگێك کە چەند ساتێك لەمەوپێش تەنها سێبەرێك بوو، بەڵام پێدەچێت منیش لەمەودوا وەك ئەو سەگە تەنها سێبەرێك بم.

## ئەوانەی لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد

لەسەربانی بەرزی ساختمانێکەوە دەمڕوانییە ئاسۆی بێکۆتای زەردەپەڕ کەلەچەند خاڵێکدا دەستەملانێی دەریاکە دەبوو. لەشوێنێکی نادیاری سەربانەکەوە کەسێك بەزمانێکی بیانی کۆپلەی گۆرانییەکی سەیروسەمەرەی دووبارە دەکردەوە.

پووشەکایەکی زەرد چواردەوری ساختمانەکەی تەنیبوو، نەك هەر بەری هەردوو دەرکەی ساختمانەکەی گرتبوو، بەڵکو بەچەشنێك بەرزببۆوە کەهێندەی بەرزی دوو نهۆمی ساختمانەکە هاتبوو. ساختمانەکە بەچەشنێك بەرز بوو کە ترس و فۆبیای بەربوونەوەو کەوتنە خوارەوەی تێدا دەبزواندم.. لەنێوەڕاستی کەنارێکدا بەتاقی تەنیا بەئاسماندا چووبوو.

هەستم بەکەمکردنی کێش و گچکەبوونی بارستەو چڕبوونەوەی جەستەم دەکرد، خۆم وەك باڵندەیەکی هەڵەرزیوی بەرکزەبایەکی توند دەهاتە بەرچاو، پێموابوو هاکا پێیەکانم لەسەربانەکە دەبڕێت و بەردەبمەوە.

وام هەستدەکرد لەدەسپێکی بینینی خەونێکی سەیرو سەمەرەدا بم.. بەچواردەوری ساختمانەکەداو هێندەی پانتایی بێبنەوپەی کەنارەکە کەسانێکی رەشپۆش پیاسەیان دەکرد، سەیر لەوەدا بوو بەبێئەوەی باران ببارێت یاخود تین و گەرمای خۆرەتاوێك تەپڵەسەرو شان و ملیان بسووتێنێتەوە، چەترە رەشەکانیان هەڵکردبوو، هەموو هەوڵ و تەقەللایەکیشیان شاردنەوەی رووکارو دەموچاویان بوو.

گەرچی لەجێگەو شوێنێکی زۆر بەرزەوە دەمڕوانییە هەموو ئەو کەسانە، بەڵام هەروەك ئەوەی لەنزیکەوە تێیان بڕوانم یان لەپاڵیاندا بم و منیش یەکێك بم لەوان، لەگۆشەنیگایەکی ترەوە چاوم بەرووکاریان دەکەوت و پاش بینینی هەموویان، بەسەرسامییەوە ئاوڕم لەو کەسە دایەوە کەلەشوێنێکی نادیاری سەربانەکەوە، هەمان کۆپلەی گۆرانییە سەیرەکەی دووبارەدەکردەوەو بەشێوەش هەر بەکەسەکانی کەنارەکە دەچوو.

لەناکاو هەستمکرد ناتوانم لەجێی خۆم ببزوێم و بەهیچ لایەکدا هەنگاو بنێم..پێموابوو هەموو پانتایی سەربانەکەم لێبۆتە گچکەبازنەیەکی داخراو کەتەنها جێگەی پێڵاوەکانمی تێدا دەبۆوە.

پاش تاوێك هەستم بەمەحاڵبوونی تێپەڕکردنی ئەو بازنەیە کرد، بێجگە لەنیگاو تێڕوانینم هیچ

شوێنێکی دیکەم نەدەبزووا، هەروەك ئەوەی جەستەم لەپەیکەرە ئێسك و خوێن و گۆشت و ماسولکە و دەمار و پێکنەهاتبێت.

تەنها نیگاکانم دەبزوان و لەدیمەنێکەوە بۆ دیمەنێکی دیکە پەلیان دەهاویشت. هەروەك بینینی کەسێکی نائاشناو نامۆ خۆمم لەدەرەوەی خۆمەوە دەبینی، هێشتاکە گوێم لەدووبارە بوونەوەی هەمان کۆپلەی گۆرانییەکە بوو.

بۆ جارێکی دی کەڕوانیمە ئەو کەسانەی کە لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد، چەترە رەشەکانیان پێنەبوو، گەرچی دەجوولآن و بەملاو ئەولادا هەنگاویان دەنا، بەلآم پێموابوو هەر هەموویان بڕواننە ئەو ئاراستەیەی کەمن لێیەوە دەمڕوانییە ئەوان، هەرچەندە ئاراستەو گۆشە نیگایەکی تایبەت نەبوو بۆ تێڕوانینم.. لەهەموو ئاراستەیەکەوەو لەیەك کاتدا هەموویانم دەبینی، تەنانەت پانتایی کەنار و دەریا و ئاسمان و دوو پەڵە هەورە تێکەڵەکە و زەردەپەڕی ئێوارەشم دەبینی.

پێدەچوو لەگەڵ هەڵکشانی زەمەن گومانم لەو شوێنە لا دروست ببێت کەتێیدابووم، نەدەکرا لەیەك کاتدا لەهەموو شوێنێکدا بم، هەرچەندە دەبوو لەسەربانی ساختمانەکەدا بم، بەلآم پیاسەکردنم لەگەڵ ئەوانەی کەلەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد یان بینینی خۆم لەدەرەوەی خۆم هەستێکی سەیریان لادروست دەکردم، بەتایبەت پاش ئەوەی دەنگی ئەو کەسەی لەشوێنێکی نادیاری سەربانەکەوە گۆرانی دەگوت گۆڕانی بەسەردا هات، ئەمە بێجگە لەوەی کەوتە گوتنی کۆپلەیەکی نوێ و بەئاوازێکی دی.

زەردەپەڕی ئەو ئێوارەیە هێشتاکە هەر وەك خۆی بوو، گرفتێك لەو زەمەنەدا هەبوو کەتێیدا بووم، لەرووییەکەوە نەگۆڕانی هەمان دیمەنی زەردەپەڕ وەستانی ساتەوەختێکی دیاریکراوی رادەگەیاند، بەلآم گۆڕانی دەنگی ئەو کەسەی لەشوێنێکی نادیاری سەربانەکەوە گۆرانی دەگوت لەگەڵ وەستانی ئەو ساتەوەختەدا نەدەگونجا ! ؟

لەهەمووشی سەیرتر گۆڕانی لەسەرەخۆی شێوەو رووکاری ئەوانە بوو کە لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد، سەرەتا هەموویان زۆر لەم ساتەوەختەی کەلەئێستادا تێیان دەڕوانم جیاوازتر بوون.

پاش گۆڕانێکی نوێی ریتمی گۆرانییەکە بەشێوەیەکی نائاسایی و ترسناك، هەموو ئەوانەی لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد بەرەو نێو بارستە پووشەکای دەوری ساختمانەکە هەنگاویاننا، هێندەی نەبرد وەك ئەوەی دیواری ساختمانەکە رێگریان نەبێت بەئاسانی تێپەڕیان کرد. هەرچەندە نەمدەویست لەگەڵیان بڕۆم بەلآم بەدەر لەویستی خۆم وەدوویان کەوتم، بەدالآنێکی دوور و درێژدا هەنگاویان ناو پاش چەند جارێك راوەستان، لەپڕ یەکێکیان دەستی بۆ دیواری دەستە راستی دالآنەکە بردو هێندەی نەبرد یەك دووخشتی دیوارەکەی لاداو پاش تاوێك دەرکەیەکی مامناوەندی وەدیارکەوت.یەك لەدوای یەك چوونە نێو هۆدەیەکی فراوان و هەروەك ئەوەی نەیانەوێت بەدوویاندا بچمە ژوور بەپەلە دەرکەکەیان داخست.

نازانم چۆن دوای ئەوە خۆم لەنزیك کەنارەکەدا بینییەوە، کات زەردەپەڕی هەمان ئێوارە بوو، پێنەدەچوو زەمەن بەهیچ شێوەیەك چووبێتە پێش. گەرچی هیچ کامێك لەوانەی کەپێشتر

لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد لەوێ نامابوون.

بەرزبوونەوەی نائاساییانەی ئاستی دەریا، شەپۆلەکانی گەیاندە چواردەوری ساختمانەکە، رەنگە ئەوانەی پێشتر لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد، زانیبێتیان کەنارەکە لەکەیدا ئاو دایدەپۆشێت، پێشوەخت لەو ناوە نەمان. ریتمی ئەو گۆرانییەی کەپێش هەنگاونانی ئەوانەی لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد بەرەو ئەو شوێنەی کەتێیدا ونبوون گوێبیستی بوو بووم، وەك خۆی دەهاتەگوێم. روانیمە ئەو بازنە گچکەیەی کەتەنها جێگەی پێڵاوەکانمی تێدا دەبۆوە سەیرمکرد نەماوە، ئیتر بازنەیەك نەبوو هەنگاوەکانم شەتەك بدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی هەنگاوبنێم و ببزوێم، یان دەمتوانی و بەڵام وام هەست دەکرد کەناتوانم. پاش دیارنەمانی ئەوانەی کە لەکەنارەکەدا پیاسەیان دەکرد پێدەچوو تەنها زەردەپەڕی ئەو ئێوارەیە وەك خۆی مابێتەوە، پێموابوو لەکۆتایی خەونێکی سەیرو سەمەرە نزیك بووبێتمەوە، بەڵام زۆر لەجاران زیاتر دەترسام کەپێیەکانم لەسەربانەکە ببڕێ و بەربیمەوە.

## وەك وەبیرم دێتەوە

وەك وەبیرم دێتەوە باڕەش لەگشت لایەکەوە، گاڵەی بەخۆڵی سەر عەردی پێدەشتەکە دەکرد و سەرجەم ریزە درەختی نێوەڕاستی پێدەشتەکەی هەراسان کردبوو، گەڵای بەهیچ کامێك لە درەختەکانەوە نەهێشتبوو کە جار جارەو تاك وتەرا لەگەڵ خۆڵبارانەکەدا دەهاتنە خوار و پێش ئەوەی بەتەواوی بکەونە سەر عەردی پێدەشتەکە، بەرزی دەکردنەوەو راپێچی نێو ئەو گەردەلوول و هەراو بەزمەی ئەو ساتەوەختەی دەکردن. ماوەیەکی ویست تابزێك هێور بۆوەو کەمێك ئاغرتر کەوتە وێزەی هەر چییەك کەلەوێدا دەستی پێی رادەگەیشت.

هەرچەندە لەنێو هەموو ئەوەدا بووم کە لەو کاتەدا روویدەدا، بەڵام هەروەك ئەوەی کە لەوێدا نەبم! ؟ باڕەشەکە نەئەوە بوو بەگژمدابێت و نەئەوەش بوو گوشارم بخاتە سەر.

وەك وەبیرم دێتەوە لەو کاتەدا قسەکانی ئەو ژنە جادووگەرە عەیارەم وەبیرهاتەوە کە لەرۆژێکی تەماویدا پێی گوتم:

(تۆ وەك عیفریتی حیکایەتە ئەفسووناوییەکان بەسیحری ساحیرێك خراویتە نێو شووشەیەکەوەو تا ئەو رۆژەی یەکێك بەرێکەوت سەرەکەی دەکاتەوە مەحکومیت بەمانەوە لەنێویدا).

ئەم ئێوارەیەو ئەو ئێوارەیەی کەئەوم تێدا جێهێشت کتومت لەیەك دەچوون. گەرچی لەو ئێوارەیەدا کەئەوم تێدا جێهێشت، بەتەواوی هەستم بەپەستان و گوشاری باڕەشەکە دەکرد، بەتاییەت ئەو دەمەی لەشارە دێرینەکە ترازام و رێگەی لاتەنیشتی ریزە درەختەکەی نێوەراستی پێدەشتەکەم گرتەبەر.

که لەکۆڵانەکەی نزیك ماڵیاندا ماڵئاوایم لێکرد، جەستەی سارد هەڵگەڕاو توندتر دارشەقەکەی لەبنباڵی قایمکرد. دوای ئەوەی چەند شەقاوێك لێی دوورکەوتمەوە، بۆ دواجار ئاوڕم لێدایەوەو تەماشامکرد، هەروەك ئەوەی پاش چەندین ساڵ ئاوڕم لێدابێتەوەو تێمڕوانیبێت، ئاوا رووکارو رەنگی پرچە رەشەکانی گۆڕانیان بەسەردا هاتبوو، جگە لەوەی لەجێی چاوەرەشە گەورەکانیشی دوو شوێن زامی قووڵ جێمابوون.

که بەتەواوی پشتم تێکردو کۆڵانەکەم جێهێشت و گەیشتمە سووچی سێ ریانەکە، گوێم لەزریکە دەنگێکی نائاسایی پڕ لەهستریاو هەلوەسەی کەسێك بوو، کەپێنەدەچوو لەقوڕگی ئەو دەنگێکی لەو چەشنە بێتەدەر.

لەنێوەڕاستی سێ ریانەکەدا پیرەژنێك قاپێ ژیلەمۆی رۆدەکرد.. داپیرەشم لەزۆر ئێوارەی شەممەدا، هەروەك ئەو پیرەژنەی دەکردو پاشان سێ بەردی بەهەر سێ لادا فڕێدەداو چاوەڕێی بیستنی یەکەمین وشەی ئاخافتنی یەکەمین کەسێکی دەکرد کە لەو ئان و ساتەدا بەوێدا تێپەڕ بایە.. زۆر لەو کەسانەی کەداپیرەمیان دەناسی و دەیانزانی نیازێکی لەدڵگرتووەو شەمۆلەی بۆ دەگرێتەوە، بۆ تووڕەکردنی کەبەو ئاستەدا گوزەریان دەکرد هیچیان نەدەگوت، یاخود دەیانگوت:( نابێت و رێی تێناچێت).

ئیدی داپیرەم لەو کاتانەدا، زۆر زویر و بێتاقەت دەبوو.. هەر یەکسەر ئەو ناوەی جێدەهێشت و دەگەڕایەوە بۆ نێو ئەو خانووە نسرمەی کەدایك و باوکمی تێدا مردبوو.

تەنها من و داپیرەم لەکاتی مردنی ئەواندا لەوێ نەبووین و نەمردین. دواتر نەئێمەو نە هیچ کەسێکی تریش هۆکاری راستەقینەی مردنیانی بۆ ساغ نەبۆوە.

پیرەمێردێکی بەساڵاچووی گەڕەکەکەمان، پاش چەند ساڵێك لەمەرگیان لەنیوەڕۆی هاوینێکی گەرمدا پێیگوتم:

( لەخەونمدا رەشمارێك لەبنمیچی یەکێك لەژوورەکانی خانوەکەتانەوە هاتە خوارێ و دایکت و باوکتی گەست).

بەڵام هەر دواتر هەمان پیرەمێرد خەونێکی تری بۆ گێڕامەوە:

( باوکتم بینی پاڵتۆ کۆنەکەی لەبەردا بوو، هاتە لام و گوتی لەمرۆژانەدا خۆم و ئەختەری ژنم پێکەوە دەمرین.. هەرچەندە نازانم بۆ دەمرین بەڵام دڵنیام پێکەوە دەمرین و مردنیشمان دەبێتە پرسیارێکی بێوەڵام، هەرگیز کەس پەی بەوەنابات بۆ لەناکاو من و ژنەکەم پێکەوە دەمرین، خۆزگە بۆخۆم لەنهێنی ئەو مردنەمان حاڵیببام تا هەر هیچ نەبێت لای ئێوە درکاندبام).

داپیرەم لەپاش مردنی ئەوان زۆر کەم دەدوا، زیاتر لەو کاتانەی کەداوای خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکەی لێدەکردم گوێم لەدەنگی دەبوو. ئەو دەمانەش کەیەکێك لەبەشەکانی یان چەند بەشێکی کتێبە پیرۆزەکەم بۆ دەخوێندەوە، چاوەکانی بریسکەیان تێدەزاو دەنکە موورووەکانی تەزبیحەکەی دەستیشی رەنگی دەگۆڕدرا.

بەڵام پێش ئەوەی کەبمرێت نەداوای خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکەی لێکردم و نەوەك هەموو

کاتێکیش تەزبیحەکەی بەدەستەوە بوو.

پاش مەرگیشی هەر لەخۆمەوە ماوەیەکی دوور و درێژ گەڕام بەشوێن تەزبیحەکەیدا، بەڵام لە هیچ جێگەو کون و قووژبنێکی ماڵەکەدا نەمدۆزییەوە.

دەنگی ناقۆلای باڵندەیەك کەنەمدەزانی لەکوێوە دەنگی دێت، زریزەی خەیاڵەکانی پساندم. کەسەرم هەڵبڕی و روانیمە پێدەشتەکە سێبەری باڵندەیەکی گەورە سەرپاکی رووبەرێکی بەرفراوانی داگیرکردبوو.

دەستمکرد بەگیرفانمدا و نامەیەك و چەند وێنەیەکی فۆتۆگرافی گۆڕەکەی ئەوم هێنایەدەر. سەیر لەوەدا بوو هیچ وێنەیەکیان لەو وێنەیە نەدەچوو کەژنە جادووگەرەکە پاش گێڕانەوەی حیکایەتێکی دوور و درێژ لەخەیاڵمدا بەرجەستەیکردبوو.

بەپێی حیکایەتەکەی گوایە ئەو کچەی کەجێمهێشتبوو پاش مردنی لەگۆڕێکی دوو مەترپان و حەوت مەتر درێژدا ناشتووە، تا هەر پیادەڕەوێك کەبەلایدا تێپەڕی، ئەوەی لابێتە پرسیار و بۆ ئەو مەبەستە لێی نزیکببێتەوە و دێڕە نووسراوەکانی سەر هەردوو کێلی گۆڕەکەی بخوێنێتەوە.

گوایە هیچ کەسێکیش لەوانەی کە خوێندوویانەتەوە، هیچی لەبارەوە ناڵێن!؟.

بەو پێیەی کەبرادەرەکەم لەنامەکەیدا بۆی نووسیبووم، گۆڕەکەی دەکەوێتە بەشی سەرووی ریزە درەختەکانی نێوەڕاستی پێدەشتەکە.

پاش قەدەرێك لەهێور بوونەوەی باڕەشەکە، بەتەواوی هەستم بەئێش و ئازاری گشت جومگەکانی لەشم دەکرد کەزیاتر بەئێش و ئازاری خۆنووشتانەوە و خۆجێکردنەوە دەچوو لەگچکە شوێنێکی دیاریکراودا.

وەك وەبیرمدێتەوە دوای کەمێك رێکردن لەپاڵ ریزە درەختەکاندا راوەستام و چاوم بۆ تاکە گەڵایەك گێڕا کەلەژێریاندا کەوتبێت، نەدەکرا باڕەش هەر هەموویانی لەگەڵ خۆیدا بردبێتە شوێنێکی تر و تاکە گەڵایەکی بۆ ژێر خودی درەختەکان نەگەڕاندبێتەوە.

بێوچان نزیکەی ماوەیەکی نادیاریکراو رێمکرد و ریزە درەختەکان هەر تەواو نەبوون. پێدەچوو لەگەڵ هەر هەنگاوێکمدا درەختێکی نوێ بچێتە بەشی سەرەوەی درەختەکان و ریزە درەختەکانم لێ درێژتر بکات.

پاش ئەوەی ئەوم لەو ئێوارەیەدا جێهێشت، رێگەی سەختی سەفەرم گرتەبەر، دواجار گەیشتمە ئەو شارە تەماوییەی کەبەهیچ شێوەیەك لەشارەکەی پێشووترم نەدەچوو. شارێکی سارد و سڕو سەیر بوو، خەڵکەکەی کەمجار لێم وردەبوونەوەو تێیان دەڕوانیم تائەو رادەیەی کەدەبوو لەخۆم بپرسم:( تۆ بڵێی من لێرە بم!). زۆر بەزەحمەت کارم لەفابریکەیەکدا چنگکەوت کە بەڕێوەبەرەکەی کاتێك مەبەستی بووایە لەکارێکی نوێدا تاقیمکاتەوە یان شتێکم پێبڵێ، ئەوە بەبێئەوەی تێمبڕوانێت، لەدوورییەکی هێجگار زۆرەوە بەشیڕەشیڕ و نەڕاندن تێیدەگەیاندم.

هەموو ئەوەی کەدەمبینی و تێیدا دەژیام، هێندەی تر گوڕو تینیان دەدایە بڵێسەی ئەو ئازارە ویژدانییەی کەهیچ کاتێك لەناخمدا خەفە نەدەبوو.

هەردەم هۆکاری جێهێشتنی ئەوم لادەبووە پرسیار و هیچ وەڵامێکم بۆ نەدەدۆزییەوە.

برادەرەکەم لەبەشێکی نامەکەیدا نووسیبووی:

(پاش ئەوەی کەجێتهێشت، بەسەرپۆشێکی سپی تاکە ئاوێنەیەکی نێو ماڵەکەی خۆیانی داپۆشی و لەگچکە هۆدەیەکدا کەوتە خوێندنەوەی هەر پەنجا و دوو بەشی کتێبە پیرۆزەکە.

وەك بۆیان گێڕاومەتەوە پاش ڕۆیشتنت بەتەواوی کاتەکانی خۆی بۆ خواپەرستی تەرخانکردووە، توانای دوواندنی ڕۆحی مردووەکانی لەخۆیدا کەشفکردووەو لەشەوە زۆر تاریکەکاندا ماڵەکەی شەوق و نووری لێبارییە، باخچەی ماڵەکەی بۆتە شوێنی گوڵ و گوڵزاری سەیر و سەمەرەی پێشتر نەبینراو، گوایە دەنگی جریوە و خوێندنی باڵندەکانی باخچەکەی کەسی شێت و دەمارگیری پێساکێن بووە.

ئیدی لەسەر داوای ئەو، زۆرینەی خەڵکی شار ئاوێنەکانی نێو ماڵەکانیان بەسەرپۆشی سپی داپۆشیوە. پێش چەند ڕۆژێك لەمردنی داوای هەڵکەندنی گۆڕێکی زۆر تەسك و ترووسکی لەچەند کەسێکی دیندار و نزیك لەخۆیکردووە و پێی گوتون:"  کەمردم لەو گۆڕەدا بمنێژن"..........).

سەرم هەڵبڕی و ڕوانیمە ئەو ئاسمانەی کە لەوکاتەدا هیچ ڕەنگێکی نەبوو، بێهوودە بوو بووم لەتەوابوونی ریزەدرەختەکان، چەند دەرۆیشتم بێسوود بوو.

لەئێوارەیەکی تەماویدا ژنە جادووگەرەکە پێیگوتم:

(ئەگەر دەتەوێت لەئازاری ویژدان و نیگەرانی و خەمخواردنی بەردەوامت قورتار بیت، بگەڕێوەو تا گۆڕەکەی نەدۆزیتەوە پشوو مەدە، ئەوجا تێر تێر بگری).

خێراتر کەوتمە هەنگاونان و ڕۆیشتن، دەبوو پێش ئەوەی شەو دابێت بگەمە سەر گۆڕەکەی، بەڵام درێژبوونی ریزە درەختەکان ئەو گەیشتنەیان لێدەکردمە مەحاڵ و تادەهات زیاتر تووشی یەئسیان دەکردم. تەنانەت کەوتمە گومان لەوەی کەبەڕاستی گەڕابێتمەوە و لەپێدەشتەکەدا بم!؟

وەك وەبیرم دێتەوە لەو کاتەدا گوتم:

(تۆبڵێی نەخەوتبێتم و خەون بەگەڕان بەشوێن گۆڕەکەیدا نەبینم).

ویستم بەنێو درەختەکاندا گوزەربکەم و لەودیوەوە چاو بۆ گۆڕەکەی بگێڕم، بەڵام بەهیچ خۆم پێئاودیو نەکرا، هێندە درەختەکان لەیەکتر نزیك بووبوونەوە کە مەحاڵ بوو مێروویەکیش بەنێویاندا بچێتە ئەو دیوەوە.

لەناکاو بارەش تێن و تاوی دایە بەرخۆی و چینێ خۆڵی پێدەشتەکەی بەحەوادا برد و پاش کەمێك بەچەشنی خۆڵباران ڕۆیکردە خوار، بەڵام گەردە خۆڵێك چییە بەر هیچ شوێنێکم نەدەکەوت.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

( ڕەنگە بەڕاستی لەنێو شووشەیەکدا بم!؟).

دەستم بەچوار دەوری خۆمدا گێڕاو هەستم بەهیچ لەمپەرێك نەکرد، پێیەکانم بزواند، زۆر بەئاسایی بۆم دەبزوا، کەوتمە ڕێ و بێپایان ژمارەم ژمارد، بەڵام نەك هەر نەگەیشتمە بەشی سەرەوەی درەختەکان بەڵکو هیچ پێنەدەچوو کە لەشوێن خۆم جووڵابێتم.

ئیدی بێهوودە لەشوێن خۆمدا هەڵترووشکام و پاش ماوەیەك وەك ئەوەی خەون ببینم، من و ئەو

لەنێو کۆڵانەکانی شارێکی تاریکدا راماندەکرد، عەردەکەی وردە شووشەی لەسەر ڕۆکرابوو، دوای ئەوەی پێمان زامداربوو کەوتینە نێو بیرێکی قووڵەوە. هەر کەکەوتینە بن بیرەکە، بەترسەوە پێڵووەکانم لێك ترازاندو چاوم بۆ ئەو گێڕا، بەڵام هەروەك ئەوەی لەگەڵمدا نەبوو‌بێت، لەهیچ شوێنێکەوە لێ وەدیار نەکەوت. لەناکاو ژنە جادووگەرەکەم هاتە پێش چاو، زۆر بەهێمنی لێم نزیك بۆوەو بۆ ساتێك بەهەردوو دەستی هەردوو چاوەکانی گرتم.. کەدەستی لادا من و ئەو بەرووتی لەنێو شووشەیەکدا بووین، پرچەکانی ژاکاو و جەستەی ئارەقاوی بوو، پاش ئەوەی کەبۆ تاوێك تێیڕوانیم لەشوێن خۆیدا وەك مۆمێك توایەوەو هێندەی نەبرد لەبەرچاومدا ونبوو.

وەك وەبیرم دێتەوە، هەر ئەوەندەی لەبەر خۆمەوە گوتم:

(ناکرێت چیدی بەشوێن گۆڕەکەیدا بگەڕێم!).

خۆم لەهەمان ساتەوەختی ئەو ئێوارەیەدا بینییەوە کە ئەوم تێدا جێهێشت. لەکۆڵانەکەی نزیك ماڵیاندا راوەستابووم و ماڵئاوایم لەکەسێك دەکرد، بەباڵا هێندەی ئەو بوو، دەموچاوی بەسەرپۆشێکی سپی داپۆشیبوو.

لێی چوومە پێش و هەر لەخۆمەوە سەرپۆشە سپییەکەی سەریم لادا، بەڵام جگە لەئاوێنەیەك هیچی دیکەم نەبینی. پاش ماوەیەك تەمێك چوار دەوری تەنیم و هەموو شتێکی لەبەرچاو ونکردم.. کەویستم دەست بنێمە نێو تەمەکە، هەستم بەوەکرد لەنێو شووشەیەکدام، چەندم کردو دەستم گێڕا، کون و کەلێنێکم لە شووشەکەدا نەبینییەوە.

رەنگە هەر لەسەرەتای گەڕانم بەشوێن گۆڕەکەیدا یان هەر لەو رۆژەوە کە ژنە جادووگەرەکە پێی گوتم لەنێو شووشەیەکدام، من هەر لێرەدا بووبێتم. بەڵام پێنەدەچوو ئەو شووشەیەی کەلەنێویدابووم، سەرێکی هەبێت تا هەر هیچ نەبێت رۆژێك لە رۆژان گەر بەرێکەوتیش بێت یەکێك سەرەکەی بکاتەوە.

## واگۆنی ژمارە حەوت

بەتەنها دەمڕوانییە وێنەی نەگۆڕاوی ئەو بیابانەی کە شەمەندەفەرە مۆدێل کۆنەکەی پێدا تێپەڕدەبوو. ئەو چرە دووکەڵە رەشەی لە بەشی پێشەوەی شەمەندەفەرەکە بەرز دەبۆوە، لەدرزو کون و کەلێنی واگۆنەکەوە دەهاتە ژوور.

کە لەئیستاسیۆنەکەدا سۆراغی شەمەندەفەری ئەو شارەمکرد، نەمدەزانی هەفتەی یەکجار و تەنها یەك شەمەندەفەر بەرەو ئەوێ دەچێت.

دوای ئەوەی بلیتم بڕی و ماوەیەك چاوەڕێمکرد، جگە لەخۆم هیچ کەسێکی دیکەم نەبینی، وەك من چاوەڕێی هاتنی شەمەندەفەرەکە بکات. بەپێی ژمارەی سەر بلیتەکە، دەبوو بچوومایەتە نێو واگۆنی ژمارە سیانزە، بەڵام بەو پێیەی هەموو واگۆنەکان چۆڵبوون، هەر لەخۆمەوە چوومە نێو واگۆنی ژمارە

حەوت کە تەنها یەك کورسی لەتەختە دروستکراوی داڕزاوی تێدابوو.

نازانم پاش ماوەیەك بەراستی شەمەندەفەرەکە کەوتە ڕێ، یان پێموابوو کە کەوتۆتە ڕێ. چونکە پاش ماوەیەکی دوور ودرێژیش جگە لەو چرەدووکەڵەی کەنێو واگۆنەکەی قانگدەدا، هیچ هەستم بەجووڵەی شەمەندەفەرەکەو کەوتنە گەڕی مەکینەکانی نەدەکرد.

یەکەمجار بوو سەفەر بۆ ئەو شارە بکەم کەپێشتر لەرێی حیکایەتێکەوە هەندێ شتم لەبارەیەوە بیستبوو، ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو ئەوە بوو کەبۆ دەبێت خەڵکەکەی لەهیچ ئان و ساتێکدا تەنانەت گەر بارانیش نەبارێ، بەبێ لەبەرکردنی جلی تایبەت و هەڵکردنی چەترەکانیان نەچنەدەر! ؟ هەر پاش بیستنی حیکایەتی ئەو شارە، حەزم بەبینینی بوو.

تەنانەت لەزیندە خەونێکدا بەبێ لەبەرکردنی جلی تایبەت و هەڵکردنی چەتر، لەبینایەکی نێو ئەو شارە هاتمە دەرەوە. بەپەلە دوو زەلام منیان لەژێر چەترەکانیان خزاندو بردمیانەوە نێو شوێنێکی داخراو، پاش ئەوەی جلە داخراوەکانیان تاسەر سنگ داماڵی و هەناسەیەکی قووڵیان هەڵمژی، یەکێکیان گوتی:

( دەبوو زانیبات کەبەبێ چەتر و ئەو چەشنە جلەی هەموو کەسێکی ئەم شارە لەبەریدایە، چوونە دەرەوە قەدەغەیە).

گوتم:

( رەنگە ئێستا گەیشتبێتمە نێو شارەکەتان).

بەسەرسامییەوە لەوەڵامدا گوتی:

( بەڵام ئەمرۆ چوارشەممەیە و ئەو شەمەندەفەرەی هەفتەی یەکجار دێتە نێو شارەکەمان لە رۆژێکی تری هەفتەدا دێت. باشە ئەو چەند رۆژە تۆ لەکوێ ماویتەوە، خۆ لەم شارەدا هیچ ئوتێل و میوانخانەیەك نییەو هیچ کەسێکیش بۆی نییە کەسێکی نامۆ بەشارەکەمان داڵدە بدات).

چەند بیرم لێکردەوە، نەك هەر چەند رۆژێك لەمەوپێش بەڵکو دوێنێشم بیر نەدەکەوتەوە و نەمدەزانی لەکوێدا بووم.

دوای قەیرێك هەردووکیان چوونە دەرەوە و جێیان هێشتم، چاوێکم بەدیوارەکانی ژوورەکەدا گێڕا، زیاد لەپێویست خاوێن بوون. هێندەی نەبرد هەردوو زەلامەکە هاتنەوە ژوورێ و چەترێك و دەستێ جلی لەوەی خۆیانیان دامێ.

لەجامی تەڵخی واگۆنەکەوە روانیمە بیابانەکە، هەمان دیمەنی نەگۆڕاوم کەوتە بەرچاو. وەك هەمیشە کاتژمێرەکەی خۆمم لەدەستدا نەبوو، نەدەکرا بزانم چەند سەعاتە لەنێو واگۆنەکەدام.

پێدەچوو لەیەکێك لەپەرستگەکانی ئەو شارەدا کچێك ببینم و دواتر لەگەڵی بدوێم و پاشان..نازانم رەنگە بۆ یەکەمجار لەو کاتەدا لەگەڵیدا بدوێم کەلەبەردەم کۆتەڵە هەرە گەورەکەی نێو پەرستگەکەدا بەچۆکدا هاتووە و دەگری، رەنگە کات و شوێنی گریانەکەشی تەنها قەدەرێك بێت بۆ یەکتر ناسینمان.

رەنگە ئەو کچە شێوەی چاو و پرچەکانی بەچەشنێك نائاسایی بن کەنەکرێت سەرنجی نەدەم و لێی وردنەبمەوە، رەنگە دوور و نزیك چاودێری بکەم و کە پەرستگەکەشی جێهێشت وەدووی بکەوم، بەڵام

بەوپێیەی کەتێکەڵ بەکۆمەڵێ پیادەڕەوی تر دەبێت و هەرهەمووشیان سەرباری جله تایبەتیەکانی بەریان چەترەکانیشیان هەڵکردووە، ئەو دەمە لێم وندەبێت و ئیدی نایدۆزمەوە. یان دەیدۆزمەوەو شەوێك لەگەڵی دەبم، تا بەیانیش پرسیاری ئەو شارە سەیر و نائاساییەی لێدەکەم. یان لەوانەیە تەنها بەبێدەنگی لێیوردبمەوە، نازانم رەنگە قەدەری پێکەوەبوونمان زۆر شتی تری لەخۆیدا شاردبێتەوە.

رەنگە پێش ئەوەی ئەو ببینم بەبەردەم باخچەیەکدا رەتببم و سەرەتا لەسەر شۆستەکەی بەردەمیەوە تێبڕوانم و پێموابێت هەموو ئەو دار و درەختەی نێوی راستەقینەن، بەڵام پاش ئەوەی دەچمە نێوی لەو راستییە تێبگەم کە هەر هەمووی لە مادەیەکی تایبەت دروستکراون.. لەو شوێنەدا سەرنجی ئەوە دەدەم کە هیچ جۆرە باڵندەیەك لەسەر لك و چڵ و پۆپی دار و درەختەکان نەنیشتۆتەوە، بەڵام پاش پیاسەکردنم بە شارەکەدا دەبینم لەهیچ شوێنێکی تری شارەکەشدا باڵندە نییە.

دوو زرتە زەلامی کەڵەگەت دەرکەی واگۆنەکەیان کردەوەو یەکێکیان بە باوەش جەستەی مردوویەکی هێنایە ژوور و بەرامبەر بەو کورسییەی لەسەری دانیشتبووم، لەسەر پەتۆیەك پاڵی خست. دەرکەکەیان پێکەوەداو دوای ئەوەی کەمێك لەجامی واگۆنەکەوە سەیریانکردم دیار نەمان.

کە روانیمە رووکاری جەستە راکشاوەکە، سەرسامبووم بەوەی هەر بەتەواوی لەو کچەی نێو پەرستگەکە دەچوو.. هەستامە سەرپێ و چەند هەوڵی کردنەوەی دەرکەی واگۆنەکەمدا، پێمنەکرایەوە بەچەشنێك لەو دیوەوە کلۆمیاندابوو مەحاڵبوو پێمبکرێتەوە. لەسەر کورسی نێو واگۆنەکە دانیشتمەوەو بینیم چۆن رەنگی جەستەکە دەگۆڕێت و دەموچاو و پەنجەکانی دەپەنمێن.

شەقامێکی ئەو شارەم هاتەوە پێشچاو کەدەیان کەس رۆژانە بەجلی تایبەت و لەژێر چەترەکانیاندا پیاسەیان دەکرد، پێموابوو منیش یەکێك بم لەپیادەڕەوەکان و بەشوێن ئەو کچەدا بگەڕێم.

جارێکی تر روانیمە جەستەی ئەو کچەی لەو کاتەدا بۆنی گۆشتی گەنیوی لێدەهات. نەمدەزانی بۆ دەبێت لەگەڵ مندا و لەهەمان واگۆنی ژمارە حەوتدا دایاننابێت. لەوەدا بوو لەواگۆنەکەوە بڕوانمە وێنەی نەگۆڕاوی بیابانەکە، کاتێك هەردوو زرتە زەلامە کەڵەگەتەکەی پێشوو، دەرکەی واگۆنەکەیان واڵاکردو یەکێکیان گوتی:

(دابەزە !).

لەوەدا بوو دابەزم، گوێم لەیەکێکیان بوو گوتی:

(جەستەکەش لەگەڵ خۆت بهێنە).

جەستەی رەق و تەقی کچەکەم لە ئامێزگرت و وەدوویان کەوتم. هەردەتگوت لەهەمان ئیستاسیۆنی پێشووی شەمەندەفەرەکەدام، تەنانەت ئەوەی بلیتیشی دەفرۆشت هەمان ئەو کەسە بوو کەپێش ئەوەی بچمە نێو واگۆنی ژمارە حەوت، بلیتم لێکڕیبوو.

بەپلیکانەیەکی دوور و درێژدا سەرکەوتم و پاشان بەڕاڕەوێکی تاریکدا رۆیشتم، هێندەی نەبرد خۆم لەبەر دەرکەی هۆڵێکی گەورەدا بینییەوە. بەدوویاندا چوومە ژوور، حەشامەتێك لەنێو هۆڵەکەدا چاوەڕێ بوون، جەستەکەم لەسەر سەکۆیەکی بەردەم حەشامەتەکە دانا.

لەوەدا بوو لەسەر یەکێك لەکورسییەکانی نێو هۆڵەکە دابنیشم، کاتێك یەکێك لەئامادەبووانی نێو حەشامەتەکە، بەچەشنە ئاماژەکردنێك ئاگاداریکردم کە دانەنیشم و بڕوانمە ئەو کەسەی لەپشت مێزێکەوە دانیشتبوو. زۆر سەیر تێدەڕوانیم و نیگاکانی چەندین پرسیاریان لەخۆ دەگرت.. بێدەنگییەکی بێزارکەر لەو شوێنەدا بەقەراربوو. هەمووان بەبێدەنگی تێیان دەڕوانیم و کەس هیچی نەدەگوت.. کاتێك زارم لێکترازان و ویستم شتێك بڵێم، هەستمکرد منیش ناتوانم هیچ بڵێم.

پاش ماوەیەکی دوور و درێژ لەبێدەنگبوونی هەمووان، ئەو کەسەی کەلەپشت مێزەکەوە دانیشتبوو پێڵووەکانی لێکنا.. دواتر هەر هەموویان بێجگە لەو کەسەی لەپشت مێزەکەوە دانیشتبوو جلە تایبەتییەکانی خۆیان لەبەرکردو چەترەکانیان بەدەستەوە گرت.

منیان پێش خۆیان ناو تا نەگەیشتینە گۆڕەپانێکی نێو شارەکە رانەوەستان، بەبێ ئەوەی وەك ئەوان جلی تایبەتم لەبەردا بێت، یان تەنانەت چەترێکشم بەدەستەوە بێت، لەبەر بارانەکەدا رایانگرتم.

گەرچی ئەوان چاوەڕێ بوون شتێك رووبدات، بەڵام هیچ رووینەداو وامدەزانی لەژێر بارانێکی زۆر ئاساییدا راوەستاوم. چەندم دەست بۆ دەموچاوی خۆمبردو لەپەنجەکانی دەستم روانی هیچ گۆڕانێکم نەبینییەوە، تەنها جیاوازیەکی ئەم بارانەو ئەو بارانانەی کەپێشتر لە ژێریدا راوەستابووم، ئەو حەشامەتە خەڵکە بوو کەچواردەوریان دابووم و چاوەڕێی شتێکیان دەکرد.

دوای ئەوەی بێهوودە بوون و هیوایان بەکاریگەری بارانەکە نەما، هێدی هێدی چواردەوریان چۆڵکردم و جێیان هێشتم. گەرچی لەو کاتەدا هیچ لەشوێنی خۆم نەجووڵام و چۆنیان جێهێشتم ئاوا مامەوە، بەڵام نەمدەتوانی ئەو هەستە لەخۆمدا بسڕمەوە کەمن هێشتاکە لەنێو واگۆنی ژمارە حەوتی شەمەندەفەرێکدام و لەجامەکەیەوە دەڕوانمە وێنەی نەگۆڕاوی بیابانێك.

## ئەو جگەرە تەڕانەی کەنەمانکێشا

ئەو دەمەی کەمن و ئەو هەوڵی کێشانی ئەو جگەرانەمان دەدا کەلەنێو قوتوویەکی ژەنگاوییدا دانرابوون، بوولێڵی ئێوارەیەکی سارد وسڕ بوو.جگەرەکان هێندە تەڕبوون بەئاستەم دانەدانەیمان بۆ بەرز دەکرایەوە، هەموو جارێکیش پێش ئەوەی تووتنی نێو کاغەزی پێچراوی جگەرەکە ئاگر بگرێت، لەنێوەڕاستەوە دەشکا.

پاش سەعاتێك سەری قوتووە ژەنگاوییەکەمان داخست کەپێدەچوو چەندی جگەرە لێدەربهێنیت ئەوەندەی بچێتەوە جێ.

بەکۆڵانێکی پێچاوپێچی تەسك و ترووسکدا هەڵگەڕاین و پێش ئەوەی بگەینە کۆتایی کۆڵانەکە، سەرێکم هەڵبڕی و روانیمە رووکاری ئەو، هێشتاکە بەتەواوی لێی وردنەبووبوومەوە کە گوێم لەدەنگی دوو ئافرەتی بەتەمەن بوو، بەزمانی خەڵکی ئەو وڵاتە دەدوان کەپێشتر تێیدا ژیابووم، هەردووکیان

رەشپۆش بوون و لەبەردەم دەرکەیەکی گەورەدا راوەستا بوون.

دوای ئەوەی پێنج شەش هەنگاوێك لەو ناوە دوورکەوتینەوە، ئەو گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە دوو ئافرەتەکەی لێ راوەستابوون.

بەناچاری وەدووی کەوتم و بەبێئەوەی بەخۆمان بزانین، هەردووکمان چووینە نێو کۆشکێکی گەورەوە، هێندەی نەبرد چووینە نێو ئەو هۆڵەی کە پیاوێکی زەبەللاحی رەشتاڵەی تێدا بوو، بەدەم شەراب خواردنەوە دەیڕوانییە ئەو کچۆڵە ناسکانەی سەمایان دەکرد. ئەو دەستی بۆ میوەیەکی قەبارەگەورە و ئاوداری نێو قاپێکی زیووینی سەر یەکێك لەمێزەکانی هۆڵەکە برد و پێش ئەوەی بیگەیەنێتە دەمی لەنێو پەنجەکانیدا، وەك تەمێکی سپی لێهات و دواتر نەما.

بەکاوەخۆ یەکە یەکەی ژوورە رازاوەو جوانەکانی نێو کۆشکەکە گەڕاین. چیت ویستبا لەکەلوپەلی سەیر و شتی دانسقە و عەجایب لە نێو سووچ و پەنای ژوورە رەنگاو رەنگەکانی کۆشکەکەدا بەدیت دەکرد.

پاسەوانە تایبەتییەکانی پیاوە زەبەللاحە رەشتاڵەکەش، لە دالان و رارەو و پەنا دیوار و نزیك دەرکەو سووچ و گۆشەی کۆشکەکە ئێشکیان دەگرت.

هەموو شتێك ئاسایی بوو تا ئەو کاتەی ئەو دەستی بۆ قوتوویەکی ژەنگاوی برد کە کۆمەڵێك جگەرەی تەڕی تێدا بوو.

پاسەوانێکی تایبەتی پشت ئەو ژوورەی کە قوتووە ژەنگاوییەکەی تێدا دانرابوو، ئێمەی بەدیکرد و هێندەی هەوا لەسییەکانیدا بوو فیکەیەکی توندی کێشا.

لەحەژمەتا بەپەیژەیەکی نێو هەمان ژووردا هەڵگەڕاین و چووینە نهۆمێکی تری کۆشکەکە. دواتریش بەپەلە، بەقادرمەیەکی دوور و درێژدا رامانکردە سەرێ و خۆمان لە سەربانێکی کاشیکراودا بینییەوە.

هێندەی نەبرد هەموو پاسەوانەکان دەوریان گرتین و بەبێ جووڵە چاوەڕێی هاتنی پیاوە رەشتاڵەکەیان کرد، بەخنەخن و هانکە هانك هاتە سەرێ و لەنێوەڕاستی پاسەوانەکانەوە، کەوتە لێخوردبوونەوەمان.

بێدەنگ چاوەڕێی هاتنی کەسێکیان دەکرد، هەر کەدەنگی کۆکەی کەسێکی ئیختیار لەخوارەوەی ئەو قادرمەیەوە هات کە دەهاتە سەربانەکە. پێنج شەش پاسەوان بەپیرییەوە چوون و ستاندێکی تەختەو پاشان کامێرایەکی مۆدێل کۆنیان هێنایە سەر و پاش بگرەو بەردەیەکی زۆر، وێنەگرەکە وێنەیەکی من و ئەو و هەموو کەسەکانی سەر سەربانی کۆشکەکەی پێکەوە گرت.

هەرچەندە چاوەڕێبووین بە قادرمەکاندا بمانبەنە خوارێ ، بەڵام سەیر لەوەدا بوو گوریسێکی درێژ و قەوییان لەنێو قەدمان بەست و زۆر بەئاسانی لەسەربانی کۆشکەکەوە بەرەوخوار شۆڕیانکردینەوە. هەر کەپێمان کەوتە سەر عەردی کۆڵانەکە، گوریسەکەمان لەنێو قەدمان کردەوەو تا پێمانکرا هەڵهاتین.

بوولێڵی ئێوارەیەکی ساردوسڕ بوو، ئەو دەمەی بردیانینە نێو ژووری موحەقیقە پیرەکە، پرسی و گوتی:(نازانم چۆن باوەڕ بەو حیکایەتەی ئێوە بهێنم، کێ هەیە بەو ئاسانییە بچێتە نێو ئەو کۆشکەوە،

یان کێ هەیە بەو ئاسانییە لێی بێتەدەر.. بۆ دەبێت ئەو بەتەنها دەستی بۆ قوتووە ژەنگاوییەکە بردبێت!؟).

پاش تاوێك کەزانی هیچ وەڵامێکی نادەینەوە، هەستایە سەرپێ و بەرەو تاقە پەنجەرەیەکی ژوورەکە هەنگاوینا.سەرێکم هەڵبڕی و لەوەدا بوو بڕوانمە رووکاری ئەو، قوتوویەکی سەر ئاوەڵای ژەنگاوی لەنزیکمانەوە دانا، کۆمەڵێك جگەرەی تەڕی تێدا بوو.

ئەو لەوەدا بوو دەست بخاتە نێو قوتووە ژەنگاوییەکەوە، کاتێك پیرە موحەقیق هاواری لێکرد:

(بەمەرجێك دەهێڵم دەستی لێبدەیت کە هەموو راستیەکەم وەك خۆی بۆ بگێڕیتەوە).

من و ئەو لەپەنایەکی ژوورەکەی پیرە موحەقیقدا، تا بەیانی نەخەوتین و هەر چاوەڕێی چاونووقاندن و خەوتنی بووین، تا لەفرسەتێکدا هەوڵی کێشانی جگەرەکانی نێو قوتووە ژەنگاوییەکە بدەین. هەرچەندە دەشمانزانی پێش ئەوەی تووتنی نێو کاغەزی پێچراوی جگەرەکە ئاگر بگرێت، لەنێوەڕاستەوە دەشکێت.

ئەو بێباکانە دەمی هەڵهێناو بەکاوەخۆ گوتی:

(ئاستەمە بتوانین تەنانەت گەر بۆ تەنها جارێکیش بێت، تەنها تەڕەجگەرەیەکی نێو قوتووە ژەنگاوییەکە بکێشین!؟).

## ساتەوەختێکی بێئاگایم

لەپەنایەکی دوورەدەستی شوێنێکدا دانیشتبووم کە پێدەچوو پێشتر شوێن دەرکەیەکی گچکە بووبێت و دواتر پڕکرابێتەوە، مابەینی بەردەکانی هێشتاکە پڕنەکرابوونەوە. کەمێك لەسەرووی شوێنجێگەی کۆنە دەرکەکە دەلاقەیەکی تێکرابوو، دوو کۆتری سپی لەوێوە سەرەتاتکێیان لەگەڵ دەکردم.

ئەو دەستنووسەی کەکەسێکی نەناسراو دابوویە دەستم، بەرگێکی رەنگ رەشی چەرمینی هەبوو، بەبۆیەکی سپی و بەخەتی فارسی لەسەر بەرگەکەی نووسرابوو:" پەڵە خەونەکان–نووسینی:س".

لاپەڕەکانی بەچەشنی هەڵبەزین و دابەزینی دڵی نەخۆشێك رەشکرابوونەوە، هەندێك لاپەڕەشی راست و چەپی بەسەردا هێنرابوو، هەندێکیشی لێکرابوونەوە، دوا لاپەڕەی دەستنووسەکەش ئیمزای–س–ی پێوە بوو.

کاتێك سەرم هەڵبڕی و روانیمە دەور و پشتی خۆم، هەموو ئەوەی پێشترم وەك خەونێك هاتە پێشچاو، چونکە وێنەی خۆمم لەئاوێنەی دەستەراستی ئۆتۆمبیلێکی مۆدێل کۆندا بینییەوە، بێجگە لەمن و شۆفێرەکە سێکەسی دیکەشی تێدابوو. راستەوخۆ دەیانڕوانییە وێنەیەکی هەڵواسراوی بەشی ناوەوەی سەرجامی پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکە و شۆفێرەکەش بەبێچاوترووکاندن دەیڕوانییە هەمان وێنە،

چەند لەوێنەکە وردبوومەوە هیچی ئەوتۆم نەبینی تابزانم چییە. هەموو ئەوانەی لەنێو ئۆتۆمبیلەکەدا بوون، لەکەسی ئاسایی نەدەچوون، بێجووڵە و پەیکەر ئاسا لەیەك خاڵیان دەڕوانی. کاتێك وردتر روانیمە ئۆتۆمبیلەکە هەرچەندە لەشوێن خۆی نەدەجوولا، بەڵام دیمەنەکانی دەور و پشتی هەروەك ئەوەی لەجووڵەدا بێت دەگۆڕدران. جار جارە خێرا دەگۆڕان و هەندێك جاریش هێواش دەبوونەوە.

ئۆتۆمبیلەکە بەنێو شارۆچکەیەکدا تێپەڕی، لەهەموو سووچ و قوژبن و کووچە و کۆڵان و گۆڕەپانێکدا، پەیکەر و وێنەی کەسێك دووبارە دەبۆوە. هیچ بوونەوەر و زیندەوەرێکم لەو شارۆچکەیەدا نەبینی، تەنها شتێك کەوەك هێمای زیندەگی لەو شارۆچکەیەدا هەبوو، وێنەیەکی هێجگار گەورەی کاڵوکرچی درەختێك بوو کە پێدەچوو نیگارکێشێکی زۆر نەشارەزا لەرۆژگارێکدا کردبێتی و کەسانێك لەبەر هەر هۆیەك لەو شوێنە هێجگار دیارەی شارۆچکەکەدا و بەو دیوارە بەرزەدا هەڵیانواسیبێت.

پاش تێپەڕکردنی شارۆچکەکە ئۆتۆمبیلەکە هاتەوە سەر شاڕێگەی سەرەکی و بەلۆفەکانی چیایەکی بەرزدا هەڵگەڕا و دوای ماوەیەك گەیشتە سەر لوتکەی چیاکەو شەومان لێداهات. ئۆتۆمبیلەکە لەبەردەم کۆشکێکدا راوەستا کە لەنهۆمە بەرزەکانیدا یەك دوو چرا دەسووتان. ئەوان پاش دابەزینی شۆفێرەکە دابەزین و لەتاریکاییەکەدا ونبوون، پاش ئەوەی قەیرێك بەسەرسامییەوە روانیمە ئەو شوێنەی کەنەمدەزانی کوێیە، منیش وەك ئەوان دابەزیم.

دارستانێکی بەسام و چڕوپڕ چواردەوری کۆشکەکەی دابوو، نەمدەزانی بەرەو دارستانەکە ملبنێم یان بەرەو کۆشکەکە بچم. هەر چۆنێکبوو رێگەی نێو دارستانەکەم گرتەبەر و پاشئەوەی تاوێك هەنگاومنا، هەستمکرد بنی پێیەکانم دێشێ، بەچەشنێکی زۆ نائاسایی گێژم، بۆ ساتەوەختێك وامزانی ناتوانم لەوەزیاتر بەسەر پێوە رابوەستم، بەڵام هێندەی نەبرد هەموو شتێك ئاسایی بۆوە و کەوتمە رێ. پرسیارەکان لەمێشکمدا هێندە زۆربوون وا باشتربوو فەرامۆشیان بکەم و بەشوێن وەڵامیاندا نەگەڕێم، هەرچەندە ئاستەمیش بوو وەڵام بۆ هیچ کامێکیان بدۆزمەوە.

لەنێو دارستانە چڕوپڕە تاریکەکەدا، بێجگە لەبینینی سێبەری تارماییەکان، گوێشم لەدەنگی هانکە هانك و هەناسەبڕکێی چەند شتێکبوو. دەبوو نەترسم و هەنگاو بنێم. پاش ماوەیەکی نەزانراو لەرۆیشتن، کەوتمە نێو کۆمەڵێك دەوەنی چڕوپڕ، کەلەتەوابوونیاندا کانییەك هەبوو، کاتێك کانییەکەم بینی ئەوەم بیرکەوتەوە من هەر لەسەرەتاوە تینوومبووە و ویستوومە قومێك ئاو بخۆمەوە، لەسەر عەردەکە راکشام و دەمم لەکانییەکە وەردا. بەڵام هەروەك ئەوەی وێنەیەکی بەدەست کێشراوبێت قوومە ئاوێك چییە نەهاتە دەممەوە، بەڵام کەلێی دووردەکەوتمەوە دەبووە کانییەکی راستەقینە و کرمۆکە و زیندەوەرە ئاوییەکانی ناوی دەکەوتنە جووڵە و ئاوێکی سازگاری لەبەر دەڕۆیشت.

دارودرەخت و گژوگیای نێو دارستانەکەش کە دەستی منیان دەگەیشتێ، لەجێی خۆیان وەك وێنەیەك رادەوەستان و نەرمی و نیانیان تێدا نەدەما. لەنێو دارستانێکی پڕ وێنە و دیمەنی جۆراوجۆردا وێڵ و ئەودالْ بووبووم.

لەهەر رێچکەو رێگەیەکی دارستانەکەوە رێگەم بگرتایەتە بەر، دەچوومەوە بەردەم کۆشکەکە.

پاش ئەوەی بێهوودە دەیان جار بەنێو دارستانەکەدا گوزەرمکرد و تێپەڕیم، بەپلیکانەیەکی دوورودرێژدا ڕێگەی کۆشکەکەم گرتەبەر. بەدرێژایی شەو پلیکانەکانم بڕی و لەبەرەبەیاندا خۆم لەبەردەم یەکێك لە دەرکەکانی کۆشکەکەدا بینییەوە، هەرچەندە وەك ئەوەی دەرکەکە داخراو بێت، زۆرم لێداو چاوەڕێمکرد. بەڵام دواتر ئەو راستییەم لائاشکرا بوو کە هەر لەسەرەتاوە بەکراوەیی جێهێڵرابوو. هێدی هێدی دەرکەکەم تەواو خستە سەرپشت و چوومە نێو هۆڵێکی گەورە، هۆڵەکەم تێپەڕکرد و بەپلیکانەیەکی تەسك و تروسکدا چوومە نهۆمی دووەم و لەوێدا خۆم بەرانبەر سێ هۆڵی گەورە بینییەوە، تەنها یەکێکیان بەرەو خۆی کێشیکردم کە لەسەری نووسرابوو:"کتێبخانە"، چوومە ژوور و کەوتمە تاوتوێکردنی کتێبەکانی، سەرجەم کتێبەکانی مێژوویی بوون، بەڵام لەشوێنێکی کەمێك نادیاری کتێبخانەکەدا بۆ جاری دووەم دەستنووسی:"پەڵەخەونەکان" م ، بەرچاو کەوت، لەسەر کورسییەکی لەتەختە دروستکراوی نزیك مێزێکی شووشە دانیشتم و کەوتمە خوێندنەوەی دەستنووسەکە.

نازانم چەند لاپەڕەی دەستنووسەکەم خوێندبۆوە، کاتێك هەستامە سەرپێ و لەپەنجەرەی بەشی دەرەوەی کتێبخانەکە نزیك بوومەوە و روانیمە دەرەوەی کۆشکەکە، لەشوێن جێگەی دارستانەکەدا پانتایی بیابانێکم کەوتە پێشچاو کە قوولەیەکی سپی لەنێوەڕاستیدا بەئاسماندا چووبوو. کەسێکی دەمامککراو بەپەیژەیەکی هەڵپەسێراو بەقوولەکەدا بەرەو سەر سەردەکەوت و بەو شێوەیە بەردەوامبوو تا گەیشتە بەرزترین ئاستی قوولەکە، ئەودەم دەستنووسێکی بەرگ رەشی چەرمینی لەهەگبەکەی دەرهێنا و لەنێو ئەو سندووقەی نا کەلەسەر قوولەکە راگیرابوو.

ساتەوەختێك دیمەنەکە لەبەرچاومدا وەکخۆی مایەوە، پاشان قوولەکە و سندووقەکەی سەری بەچەشنی وردە کاغەز داباریندخوار و نەشمزانی کەسەکە چی لێبەسەرهات. روانیمە دەستنووسەکە کەپێشتر لەسەر مێزەکە جێمهێشتبوو، لەجێی خۆیدا نەمابوو، هەموو سووچ و قوژبنێکی کتێبخانەکە و تەنانەت نێو هەموو چەکمەجە و دۆڵابەکانیشی بەشوێندا گەڕام بەڵام نەمبینییەوە.

کۆشکەکەم جێهێشت و دوای ئەوەی گەیشتمە سەر هەمان کانییەکەی پێشووی نێو دارستانەکە. بۆ تاوێك رۆچوومە نێو خەونە ساتێکی خۆڵەمێشی و رەنگە قەیرێکیش ئاگام لەدەور و بەری خۆم نەمابێت. کاتێك بایەکی سارد بەئاگای هێنامەوە، هێشتاکە لەنێو ئۆتۆمبیلە مۆدێل کۆنەکەدا دانیشتبووم و سەیری گۆڕانی وێنە و دیمەنە گۆڕاوەکانی دەوروپشتی خۆمم دەکرد.

## دوا نامەیەکی هاوڕێکەم

کاتێك لەبەردەم قەڵا زۆر دێرینەکەی شارۆچکەکەدا راوەستابووم، گوێم لەتەهلیلە و زیکری ئەو دەروێشانە بوو کەلەپێش حەشامەتەکەوە دەڕۆیشتن. هەر لەخۆمەوە وەدووی حەشامەتەکە کەوتم کە

زۆر بەبێدەنگی گوێیان بۆ دەنگی دەروێشەکان هەڵخستبوو.

پاشئەوەی حەوتجار بەدەوری قەڵاکەدا سووڕانەوە، ڕێگە بەردەڵانەکەی دەستەچەپی قەڵاکەیان گرتەبەر، دوای سەعاتێك گەیشتنە تاکە گۆڕستانێکی شارۆچکەکە کە زۆر لەشارۆچکەکە فراوانتر و گەورەتر بوو. لەنێوەڕاستی گۆڕستانەکەدا حەشامەتەکە بەشێوەیەکی بازنەیی چواردەوری تابووتێکیان تەنی و پاشان بەچوارمشقی و هەریەك لەجێگەی خۆی دانیشت. بەڵام دەروێشەکان تا نەگەیشتنە تەپۆڵکەیەکی نزیك گۆڕستانەکە هیچ ڕانەوەستان و لەوێشەوە ونبوون. ماوەیەك بەبێدەنگی وەك هەر کەسێکی نێو حەشامەتەکە بەچوارمشقی لەشوێن خۆمدا دانیشتم.

لەناکاو هەروەك ئەوەی کەیەکێك پێیگوتبێتم، هەستامە سەرپێ و ڕوانیمە تابووتەکە، پەتۆ ڕەشەکەی سەری زۆر سەرنجی ڕاکێشام. کاتێك کەبۆ چەند جارێك هەمان ئەو پرسیارەم دووبارەکردەوە کە لەو کاتەدا بەخەیاڵمدا هاتبوو و سەیرمکرد کەسیان وەڵام نادەنەوە تەنانەت لەشوێن خۆشیان نابزوێن، پێدەچوو هەر بەجەستە لەو شوێنەدا بن. بۆ جارێکی تریش هەستامە سەرپێ و ئەمجارەیان خۆمگەیاندە تابووتەکە، بەکاوەخۆ پەتۆ ڕەشەکەی سەر تابووتەکەم هەڵدایەوە تا سێبەشی تابووتەکە هیچم نەبینی، لەدوا بەشیدا سەری کەسێکم بینی کە هێشتاکە چاوەکانی کراوەبوون. دوای ئەوەی پەتۆکەم وەك خۆی دادایەوە و شتێك لەتابووتەکە دوورکەوتمەوە، وامبەخەیاڵدا هات کەرەنگبێت پێشتر ئەو سەرەم لەکات و شوێنێکی تردا بینیبێت.

گەڕامەوە شوێنی خۆم و وەك ئەوان کەوتمە تێڕوانینی لەپی دەستی ڕاستم، تادەهات عەردەکە ساردتر و دنیا تاریکتر دەبوو. دەبوو بگەڕێمەوە بۆ نێو ئەو ئوتێلەی کە بۆ تەنها شەوێك ژوورێکم تێدا بەکرێگرتبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێك پاڵی پێوە دەنام بۆ زانینی ماجەرای سەری نێو تابووتەکە. دەیان پرسیار لەناخمدا سەرەتاتکێیان بوو، بۆ دەبێت نەینێژن، بۆ دەبێت بەبێهەست و خوست لەچواردەوری دانیشتبێتن، دەروێشەکان بۆ جێیان هێشت و بۆکوێ چوون؟ لەهەمووشی سەیرتر هیچ گۆڕو چاڵێك بۆ ناشتنی ئامادەنەکرابوو!

لەپڕ دایکردە باران و تاوێکی خایاند، هەر کەبارانەکە خۆشیکردەوە، یەکەیەکە هەستانە سەرپێ و چوارکەسیان تابووتەکەیان نایە سەر شانیان و لەپێش حەشامەتەکەوە، بەرەو شارۆچکەکە کەوتنە ڕێ. بەکاوەخۆ وەدوویان کەوتم، تاگەیشتنە بەردەم پەرستگەیەکی لەبەرد دروستکراوی ڕەنگ سپی. لەوێدا تابوتەکەیان جێهێشت و جیاجیا لەسووچ و سەری کووچە و کۆڵانەکانی چواردەوری پەرستگەکەوە ونبوون.

هێدی هێدی لەتابووتەکە نزیکبوومەوە و لەوەدابوو کەپەتۆ ڕەشەکەی سەری هەڵبدەمەوە، کاتێك گوێم لەددانە جیڕەو وەڕینی گەماڵێك بوو کە زۆر لەنزیکمەوە ڕاوەستابوو، پاشە و پاش گەڕامەوە و لەپاڵ دیواری پەرستگەکەدا ڕاوەستام، دوای کەمێك گەماڵەکە بەبێدەنگی لەشوێن خۆیدا هەڵتووتا کە لێی وردبوومەوە زۆر بەنائاسایی هاتە پێشچاوم، چ چاوەکانی بەشێوەیەکی لاکێشەیی بەرەو لای هەردوو گوێچکەکانی هەڵکشابوون، چ کەڵبەکانیشی زۆر لەکەڵبەی گەماڵی ئاسایی درێژتر و قەوی تربوون. دوای ئەوەی گەماڵەکە چاوەکانی لێکناو خەوت، ڕێگەی ئۆتێلەکەم گرتەبەر و خۆمگەیاندە

نێو ئەو ژوورەی کە بۆ تەنها شەوێك بەکرێمگرتبوو.

هێشتاکە دوا نامەی هاورێکەمم نەگەیاندبووە شوێن مەبەست، دەبوو دوا وەسیەتێکی هاورێکەم بهێنمە دی، پێشئەوەی کەدوا هەناسەی بدات نامەکەی نووسی و دایەدەستم، هێندەی کەقسەی پێکرا گوتی:(بچۆرە شارۆچکەی سامۆش و لەبەردەم قەلا زۆر دێرینەکەیدا چاوەرێی هاتنی ئەو بە).

فریای ئەوە نەکەوتم پرسیاری ناو و ناونیشانی ئەوی لێبکەم. ئەو شەوە تابەیانی نەخەوتم و هەر لەغایەڵەی سەری نێو تابووتەکەدا بووم.

چێشتەنگاو جانتاکەم پێچایەوە و لەئوتێلەکە چوومەدەر، بەپەلە پرووزێ خۆمگەیاندە لای پەرستگەکە، هێشتاکە تابووتەکە لەهەمان شوێنی خۆیدا بوو، سەیری چواردەوری خۆمکرد، دوورونزیك نەهیچ کەسێکم کەوتە بەرچاو و نەگەماڵەکەشم بینی. بەفرسەتم زانی لەتابووتەکە نزیکبوومەوە و بۆ جارێکی دی پەتۆ رەشەکەی سەریم لادا، بەڵام سەرەکەی تێدا نەبوو. لەوکاتەدا کەسێك کەنەمزانی چۆن چۆنی گەیشتە بەردەم دەرکەی پەرستگەکە، بەتوندی کەوتە لێدانی دەرکەکە، هێندەی نەبرد پیرەپیاوێك دەرکەی پەرستگەکەی والاکرد و لەگەڵ کەسەکەدا کەوتە گفتوگۆ، سەیر لەوەدابوو تەنها لێویان دەبزواو هیچ دەنگ و سەدایەکیانم نەدەهاتە گوێ. بەڵام هەر لەخۆمەوە پێموابوو کەکەسەکە سۆراخی سەری نێو تابووتەکە بکات و پیرە پیاوەکەش لەوەڵامدا پێبڵێت:( هێشتاکە سەرەکە نەگەیشتۆتە نێو شارۆچکەکە تا بخرێتە نێو ئەو تابووتەی کەبۆی ئامادەکراوە). پاش ئەوەی پیرە پیاوەکە چەند جارێك سەری بەلای راست و چەپی خۆیدا راوەشاند، دەرکەی پەرستگەکەی پێوەدا. کەسەکە هەروەك ئەوەی لەپڕ غەیب بووبێت چەند چاوم بۆگێرا، دوور و نزیك لەهیچ شوێنێکدا بەدیمنەکرد.

بەیەکێك لەپەرستگەکانی دەستەراستی پەرستگەکەدا رەتبووم و پاش سەیرکردنی یەکەیەکەی خانووە لەبەرد دروستکراوەکانی کۆلانەکە، خۆم لەبەردەم قەلا زۆر دێرینەکەدا بینییەوە، لەوەدابوو لەتاتەبەردە گەورەکانی شوورەی قەلاکە رابمێنم، کاتێك پیرەژنێکی پێپەتی بەلامدا تێپەڕبوو، هاوارم لێکرد:( داپیرە نامەیەکم پێیە بۆ ئەو، چما ئێوە نایناسن؟!). هەروەك ئەوەی کەگوێی لێمنەبووبێت، هەڵوێستەی بۆ نەکرد و بەیەکێك لەرێگەکاندا بەرەو قەلاکە هەڵزنا. لەوەدابوو کەوەدووی بکەوم کاتێك گوێم لەدەنگی لێدانی دەفی دەروێشەکان بوو کە لەپێش هەمان حەشامەتەکەی دوێنێوە رێیاندەکرد. ماوەیەك وەدوویان کەوتم، بەڵام پاشان هەروەك ئەوەی لەراستیدا نەبووبێتن، لەپڕ لەبەرچاومدا ونبوون.

دواتر لێڵاییەك بەرچاومی تەنی و بۆ چەند ساتێك هیچم نەبینی کە بەرچاوم رووناك بۆوە، زۆر لەنزیکەوە گوێم لەدەنگی هاورێکەم بوو، پێموابوو ئەو دوا نامەیەم بۆ بخوێنێتەوە کەنووسیبووی:( ئازیزم لەخەونمدا تۆم لەبیابانێکدا بینییەوە، وەك لەخەونەکەمدا دەمبینی خۆشت نەتدەزانی چۆن چۆنی رێتکەوتۆتە ئەو بیابانە، هێندەتینوو بوویت کەجگە لەقوومێك ئاو بیرت لەهیچیتر نەدەکردەوە، لەکاتێکدا کەچاوت رەشکەوپێشکەی دەکرد، چووار زرتەزەلام وەك حەیوانی قوربانی لەسەر لمی بیابانەکە پاڵیان خستیت و چەقۆیەکی زۆر تیژیان خستە سەر ملت).

# هەڵئاوسانی کیسە ئاوییەکان

لەنێوەڕاستی کەنارێکدا راوەستابووم، هەروەك ئەوەی لەکۆنە فیلمێکی رەش و سپی بڕوانم، پێپەتی بەکراسێکی ئاودامانی سپییەوە دەمڕوانییە شەپۆلە رەش و سپییەکانی دەریاکە لەکاتێکدا کەشتییەکی چارۆکەدار هێدی هێدی شەپۆلەکانی دەبڕی. باڵندە ئاوییەکانی ئەو دەور و بەرە هەربەوە دەچوون مۆمیاکرابێتن، بێجووڵە لەشتێکیان دەڕوانی.

ئاوڕم دایەوە و ئەو کورسییەم بینی کەلەکۆمەڵێ ئێسکی پتەو و قەوی دروستکرابوو، ئاوێنەیەکی لاکێشەیی گەورەش لەدووری چەند مەترێکەوە لەپشت کورسییەکە دانرابوو.

چەند باڵندەیەکی ئاوی وەك ئەو بەلەمە لەکاغەز دروستکراوانەی کە بەمنداڵی دروستمەدەکردن سەر ئاو کەوتبوون. کەشتییە چارۆکەدارەکە لەخاڵێکی وەستاوی تەماشامدا بووە هەڵم و لەبەرچاوانم ونبوو.

لەبەر خۆمەوە گوتم:( رەنگە هێشتاکە بەتەواویی بێدار نەبووبێتمەوە).

بەکاوەخۆ ئاوڕێکی دواوەم دایەوە و جووتێ پۆستاڵی رەشی بێقەیتانم لەسەر کورسییەکە بینی، کەسێکی پێپەتی لەئاوێنەکەوە تێی دەڕوانیم، هەرچەندە رووکاری بەهیچ شێوەیەك لەمامۆستای زیندەوەرزانیمان نەدەچوو، بەڵام هەر یەکسەر ئەوم وەبیر هاتەوە، بۆ یەکەمجار بەسەرهات و سووڕی گەشکردنی ئەو بوونەوەرە هێجگار ترسناکەم لەوەوە بیستبوو.

لەو کاتەدا دڵنیا نەبووم بەپێوەم یان دانیشتووم، بەڵام پڕ بەدڵ حەزمدەکرد دەستم بگاتە لمی کەنارەکە و مشتێ لم بدەم بەرووی ئاوێنەکەدا تا لەبوونی راستەقینەی دڵنیابم. سەرێکم هەڵبڕی و روانیمە جووتە پۆستاڵەکەی سەر کورسییەکە، لەجێی خۆیاندا نەمابوون. نەمدەزانی کەی و چۆن لەپێمکردبوون، نیو بەنیو لەلمەکە رۆچووبوو، لینجاوێکی لەرەنگی خۆی لەبەر دەڕۆیشت.

لەو دەمەدا هەروەك ئەوەی یەکێك شتێکم بەگوێدا بچرپێنێت و پێم بڵێت:( سەر هەڵبڕە). هێشتاکە هەمان کەسەکەی پێشوو لەئاوێنەکەوە تێیدەڕوانیم و بەدەستەراستی ئاماژەی بۆ وێنەی کیسە ئاوییەکان دەکرد کەلەبەشی سەرەوەی ئاوێنەکەدا کێشرابوو.

تا ئەودەمەش کورسییەکە کەسی لەسەر دانەنیشتبوو، لەوەدابوو شتێك بڵێم گوێم لەهەڕوەڵەکردنێکی کەمخایەنبوو، بەبێئەوەی بیانبینم لەبەردەممدا یەك لەدوای یەك راوەستان، یەکێکیان لەریزەکە چووە دەرەوە و بەلەقە ئاوێنەکەی پشت کورسییەکەی ورد و خاشکرد، هاڕە و دەنگی بەربوونەوەی پارچەکانی زۆر ترسناکبوو. دوای کەمێك ئەو کەسەی کەئاوێنەکەی شکاندبوو، بەشێوازێکی سەربازی چۆوە نێو ریزبەندییەکەی کەسە راوەستاوەکان و بۆ تاوێك لەبێدەنگییەکی قووڵدا جێیان هێشتم.

ئیدی نازانم بۆ  تاقیکردنەوەی زیندەوەرزانی ئەو ساڵە تەڕوتووشەم وەبیرهاتەوە، کەیەکێك لەپرسیارەکانی تایبەت بوو بەکیسەئاوییەکان و هەر لەو رۆژەشدا بوو کە باڵابەرزترین پیاوی شارەکیان کوشت، پاش تەواوبوونی تاقیکردنەوەکەشمان زۆر پرسیاری هۆکاری کوشتنەکەیم پرسی، کەچی زۆربەی ئەوانەی پرسیارم لێکردن پێیان وابوو نەکوژراوە بەڵکو کیسەئاوییەکانی نێو هەناوی تەقیوە، تەنها چەند کەسێك دەیانگوت کوژراوە، بەڵام سەبارەت بەهۆکاری کوشتنەکەی کۆکنەبوون، شتی جیاجیان دەگوت، ئەوەی کە زۆر سەرنجی راکێشام قسەی یەکێکیان بوو کەپێیوابوو لەبەر باڵابەرزییەکەی کوژرابێت. پاش هەفتەیەك لەتاقیکردنەوەکانی زیندەوەرزانی مامۆستای زیندەوەرزانی لەرۆژێکی ساردوسڕدا بەتووڕەییەوە خۆیکرد بەژووردا و پاش ئەوەی سەرکۆنەی هەموومانیکرد، گوتی:( لەبەر ئەوەی کەستان وەڵامی پرسیاری کیسە ئاوییەکانتان نەزانیوە لەپرسیارەکانی تریشدا سفرتان بۆ دادەنێم، ئەویش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان لەبەرئەوەی لەهەموو وانەکانی دیکەی زیندەوەرزانی زیاتر من باسی کیسەئاوییەکانم بۆ کردوون، دووەمیشیان لەبەرئەوەی ئەوەی کەسێك هیچ لەبارەی کیسەئاوییەکانەوە نەزانێت ناتوانێت لەم وڵاتەدا بژی، کەمۆڵگەی گەشەکردنی کیسەئاوییەکانە.

لەوەزیاتر رێگەیاننەدام رۆبچمە نێو یادەوەرییەکانی ئەو زەمەنە، زۆر بەئاسانی برمیانە سەر کورسییەکە. لەو کاتەدا گوێم لەناڵەوهاڕەی ترسناکی دەریاکەبوو، بەشێوەیەك کەتا ئەودەمەش گوێم لەهاڕەی لەو چەشنە نەبووبوو. پۆستاڵەکانی پێم بۆ پێشەوەخزا، گوێم لێبوو یەکێکیان گوتی:( پۆستاڵەکانی تاکە و تاکن). چوار دەستەبەرزیانکردمەوە و نزیك دەریاکە جێیان هێشتم. هێندەی نەبرد شەپۆلە سوێرەکانی دەریاکە بەتەواوی تەڕیانکردم و دواتریش لەلووت و دەممەوە رۆچوونە نێو بۆشاییەکانی هەناوم، کەپێموابوو پڕبن لەکیسە ئاوییەکان. باڵندە ئاوییەکان لەو دەمەدا لەشتێکیان دەڕوانی.

هێندە کەنەفت و برست لێبڕاوبووم، پێمنەدەکرا راچەنێم و لەبەشی کۆتایی ئەو خەونە هەڵبێم، چەندم حەزدەکرد پێمکرابا و بمتوانییایە بڵێم:( ئەوەی کەدەیبینم تەنها ساتەوەختێکی تاڵ و سوێری خەونێکی بەسەرچووە). یان پڕبەدەم هاوارمبکردایە و گوتبام:( ئەوەی کەدەیبینم تەنها حیکایەتی کیسە ئاوییەکانە).

## وردەئێسکەکان و گەمەی کاپتن

من و کاپتن لەیەك رۆژدا لەدایکبووین، ئیدی ناشزانم لەیەك رۆژدا دەمرین یان نا. ئەم چیرۆکەی کەلێرەدا هەوڵی گێڕانەوەی دەدەم، چیرۆکێکی زۆر سادە و ئاساییە و زۆربەی خەڵکی شارەکەی من و کاپتن، دەیزانن و لە نێو خۆیاندا دەیگێڕنەوە.

کاپتن کەسێکی زۆر ئاسایی بوو، وەك هەموو کەسێکی دیکەی ناوچەکە، پاش ئەوەی بەرێکەوت و لەساتەوەختێکی توورەبوونمدا کەسێکی نەناسراوی شارم کوشت، خەڵکەکە وایانزانی ئەو کوشتوویەتیەتی و هەر ئەوەش بووە مایەی یەکەمین ناوبانگ و ناسرانی. بەحوکمی برادەرێتیمان هیچ دەنگم نەکرد و بگرە هێدی هێدی کۆمەڵێك حیکایەت و بەسەرهاتی ئازایەتی تریشم دایە پاڵ ناوی کاپتن و بەماوەیەکی کەم بووە یەکێك لەو کەسانەی کەچەقۆکێش و پیاکوژە راستەقینەکانیش لێی دەترسان و حیسابیان بۆ دەکرد.

من و کاپتن هاوشێوە بووین، بەچەشنێك پاش ئەوەی کاپتن بووە سەرۆکی شار، لەزۆر بۆنەو مەراسیمدا کەخەڵکی شار حەزیان بەیادکردنەوەیان هەبوو، من لەجێی ئەو گوتارە دوور و درێژەکانم دەخوێندەوە، پاش ئەوەی دنیایەك وێنەی شیعری و سەجع و رستەی نغرۆ لە رەوانبێژیم تێکەڵ دەکردو هەموو جارێکیش زیاد لەنیوەی ئامادەبووان لەنیوەی گوتارەکەدا دەخەوتن.

خەونی هەمیشەیی کاپتن بەجەنگ و ماجەراکانی جەنگەوە وای لێکرد قەڵایەکی نزیك شار بکاتە بارەگای خۆی کە زۆر لەمێژبوو دروستکرابوو، هێشتاکە کۆشکەکەی نێوی یەکێك بوو لەکۆشکە جوانەکانی دنیا. بەڵام جەنگی ئەندێشەکراو لای کاپتن ئەو جەنگەی ئێستای دنیا نەبوو، بەڵکو جەنگە دێرینەکان بوو ئەو جەنگانەی شمشێر و رم و مەتاڵ و هەموو شێوازە کۆنەکانی جەنگی تێدا بەکار دەهات. کاتێك لە کاپتن–م پرسی:( چ پێویست دەکات بگەرێینەوە بۆ شێوازە کۆنەکانی جەنگ). لەوەڵامدا گوتی:( بێجگە لەسیحر و چێژی تایبەتیی ئەو جۆرە جەنگانە، هەرخۆم بێزارم لەبۆنی باروت و بینینی کەرستە نوێیەکانی جەنگ، ئەمە جگە لەوەی لەجەنگە نوێیەکاندا قارەمان ون و نادیارە، یان دەتوانم بڵێم هەر نییە. من پێویستم بەجەنگێکی روو بەرووە، جەنگێك بتوانم رووکاری دوژمنەکەم ببینم، دەبێت وەك رۆستەم بێپسانەوە لەگۆرەپانی جەنگدا یەك لەدوای یەکی دوژمنەکانمان تێکبشکێنین).

زۆر بەئاسانی کاپتن توانی سەرۆکی شارەکانی دەوروبەر بکاتە دوژمنی خۆی و بانگهێشتیان بکات بۆ نێو گۆرەپانی جەنگ، هەرچەندە سەرەتا شێوازی کاپتنیان لەجەنگدا پێنامۆ بوو بەڵام دواتر بۆ خۆشیان گەیشتنە ئەو راستیەی کەواتای راستەقینەی جەنگ، تەنها بەگەرانەوە بۆ رابردوو، دەکرێت بەرجەستە بکرێت. ئەوە بوو لەکاتی جەنگدا بەشێوازی کۆن قارەمانێك لەهەر بەرەیەك دەچووە پێش و پاش ناوهێنانی خۆی و سولالەیەك لەناوی یەك لەدوای یەك، شەرەشیر دەستی پێدەکرد و دواتر چەند کەسێکی تریش لەهەر دوو بەرەکە بەو شێوەیە خۆیان تاقیدەکردەوە، تا کار دەگەیشتە تێکچرژانی جەنگاوەرەکانی هەردوولا. ئیدی جەنگی واهەبوو سێشەو وسێرۆژی دەخایاند، هەشبوو هەر زوو بەتێکشکانی بەرەی دوژمن تەواو دەبوو. کاپتن لەهیچ جەنگێکدا تێکنەدەشکا، هەبوون دەیانگوت سیحری سەرکەوتنەکانی لەوەدایە ئەو قەڵایەی کردۆتە بارەگا ، لای ئەوانیش مانەوە لەنێو قەڵایەکی مێژوویدا بەواتای ئەندێشەکردنی هەرچی باشتری جەنگ دێت. من فەرماندەی هەموو جەنگاوەرەکانی کاپتن بووم، لەهەموو جەنگەکاندا زۆرترین کەسم لەدوژمن دەکوشت، گەرچی حەزم بەجەنگی نێو بیابان نەبوو بەڵام بەوپێیەی قەڵاکەمان دەیروانییە سەر بیابان و بۆ راودوونانی دوژمنەکانی کاپتن

کاتێك هەڵدەهاتن، دەبوو بەرەو بیابان وەدوویان بکەوم، تائەسپەکانمان بڕستی لێدەبڕا ڕانەدەوەستاین.

من و کاپتن هیچ کاتێك یەکدیمان نەدەڕەنجاند، هیچ کاروبار و ئیش و کارێکی کاپتن لەمن شاراوە نەبوو، بێجگە لەنهێنی ژوورێکی تایبەتی نێو کۆشکەکەی کەپێش لەدەستدانی  هەر پێنج پەنجەکەی دەستەراستم لەجەنگدا نەمبینیبوو. نهێنییەکی دیکەی کاپتن–یش کە جگە لەمن هیچ کەسێکی تر نەیدەزانی و نەشدەبوو بیزانێت، ئەوەبوو کە کاپتن بەهۆی نەخۆشییەکەوە کە لەهەرزەکارییەوە تووشی بووبوو، نەیدەتوانی بپەڕێت. هەر بۆیە ئەو کاتانەی بەبەرچاوی پاسەوانەکانییەوە بەپرچ کچۆڵە تازە پێگەیشتووەکانی دەبردە نێو ژوورە تاریکەکەی خۆی، ئەو کاتانە من لە قووڕنەیەکی ژوورەکەیدا چاوەڕێمدەکرد، ئیدی بەبێئەوەی لەو تاریکییەدا کچۆڵەکە هەست بکات، پاش ئەوەی کاپیتن دەچووە سەری و هێندەی لێدەدا تا دەبوورایەوە ئەوکات من کاری خۆممدەکرد و هەمیشەش پاش تەواوبوونم لەکارەکە دەستی دەخستە سەرشانم و دەیگوت:( خۆزگە منیش وەك تۆ بوومایە، ئەوەی کەهەمە چ بەهایەکی هەیە ئەگەر نەتوانم). ئیدی پاش گوتنەوەی ئەو دێڕەی کەلەو کاتانەدا دەیگوت چاوەکانی فرمێسکی تێدەزا و حوزن و ماتەمێکی سەیر دایدەگرت.

جەنگ گەمەیەکی بەردەوامی نەك هەر من بەڵکو هەموو جەنگاوەرەکانی کاپتن بوو کە بەتەواوی چێژمان لێدەبینی و بەراوەشاندنی شمشێرەکانمان ئارەزوویەکی شێتانەی کوشتنمان تێدا دەبزووا، لەو کاتانەدا دەمانویست جەنگ هەرئەوەندە نەبێت کەپێی ڕاهاتبووین، بەڵکو زۆر لەوە زیاتر بێت و لەرۆژگارێکدا بتوانین دنیا داگیربکەین و ژمارەیەکی لەبننەهاتوو لە نێوگەڵی تازە تاقیبکەینەوە، دنیایەك شاری نەزانراو کاولبکەین، دەمانویست بڕۆین و هەر نەوەستین. بەڵام دەبوو ڕێگەیەکی تر بدۆزینەوە چونکە لەڕێی بیابانەوە تەنها ئەوەندەمان پێدەکرا کە کردبوومان، دەبوو ڕێگەیەك بدۆزینەوە ئەسپەکانمان ماندوو نەکات، جیاواز لەبیابان گەرم و وشکوبرنگ نەبێت.

بەڵام لەدوا جەولەی جەنگێکدا هەموو ئەوەی کەبیرم لێدەکردەوە و بەتەمابووم بیکەم کۆتایی هات. ئەو جەنگەمان لەگەڵ سەرسەخترین جەنگاوەرەکانی شارێکی دوورە دەستبوو، کەبەساڵێك ڕۆیشتن گەیشتبوونە بەردەم قەڵاکەمان. لەدوا جەولەی ئەو جەنگەدا ڕووبەڕووی کەسێکی زۆر ڕك ئەستوور بوومەوە، کاتێك لەسەر ئەسپەکەم هەڵیدامە خوارەوە، چاوەڕێبووم بمکوژێت، کەچی گوتی:( ناتکوژم تەنها پەنجەکانی دەستی ڕاستت دەبڕم و دەتکەمە عیبرەت، تۆ بەبێ پەنجەکانی ئەو دەستە ناتوانیت بجەنگیت و هەر دەبێت بەداخی لەدەستدانی ئەو پەنجانەوە سەر بنێیتەوە).

ڕۆژانێکی زۆر لەجێگا کەوتم و ئاگام لەماجەرای جەنگ و بەسەرهاتی کاپتن نەما، ئەگەرچی هەر لەکۆشکەکەی ئەودا بووم و ژوورەکەم لەپاڵ ژوورە تایبەتە نهێنییەکەی ئەودا بوو.

کاتێك زامەکانم سارێژ بۆوە و بیرم لەوەکردەوە بچمە لای کاپتن و پێی بڵێم:( دەتوانم دەستی چەپم لەجەنگەکانی داهاتوودا بەکاربهێنم). نەك تەنها لەبەر ئەوەی دڵی خۆشبکەم، بەڵکو لەبەرئەوەی لەمابەینی وڕێنەکردن و وڕێنەنەکردندا خەیاڵێکی وام بەمێشکدا هاتبوو. شەو درەنگان لەکاتێکدا هێندەی نەمابوو دەرکەی ژوورەکەم بکەمەوە، ئاگام لێبوو دەرکەی ژوورە نهێنییە تایبەتەکەی کاپتن

کرایەوە. کاتێك چوومەدەر سەیرمکرد دەرکەکەی کراوەیە، بەبێدەنگی چوومە ژوور، دیواری ژووری یەکەم بەوێنەی جۆراوجۆری ساتەکانی ئەو جەنگانەی کەکردبوومان رازابۆوە، وێنەی کوژراوەکانمان بەجیا و لەهەر سێ لای دیکەی دیوارەکە هەڵواسرابوون. لەنێو وێنەی کوژراوەکانیشدا وێنەی ساتەوەختێکی جەنگ هەڵواسرابوو کەوێنەگرەکە زۆر زیرەکانە ساتەوەختی بڕینەوەی پێنج پەنجەی دەستەراستی جەنگاوەرێکی وێنەگرتبوو.

ژووری دووەم پڕبوو لەکەرستە کۆنینەکانی جەنگ، هێشتاکە سەری رمەکان بەخوێنێکی گەش سووربوون، پێدەچوو تازە لەجەنگ هێنرابێتنەوە. ژمارەیەك لەشمشێر و مەتاڵ و گورز و کەرستەکانی تری جەنگیش بەدیوارەکانییەوە هەڵپەسێرابوون. ژووری سێیەم یەکپارچە وێنەی ئەو کچۆڵانە بوو کەمن لەجێی ئەو هینمکردبوون، سەرباری ئاوێنەیەکی گەورەش کەبەرانبەر بەدەرکەی ژووری سێیەم هەڵواسرابوو. کاتێك بەرانبەر ئاوێنەکە راوەستام، کاپتنم بینی رووکاری زەردبوو، ردێنی سپی و باڵای نەوی، ئەو کوڕە باڵابەرزەی پێشووتر نەبوو، زۆر بەزەحمەت ناسیمییەوە، بەڵام دیاربوو چاوەڕێی دەکرد من دەست بەقسان بکەم. هەرچەندە هیچ فرمێسکێکم بەچاوییەوە نەبینی بەڵام گوتم:

(– گەورەم کاپتن بۆ دەگریت).

زۆر کزۆڵانە تێیڕوانیم، بەشێوەیەك کەهەیبەتی جارانیم لەچاوەکانیدا نەبینییەوە، گوتی:( دەمێکە ئەمە ژووری گریانمە).

کاتێك لەنێو لەپی دەستەراستی وردبوومەوە، ژمارەیەك وردەئێسکم بینی، گوتم:( ئەی ئەو وردە ئێسکانە چین).

پاش ئەوەی کەمێك سەیری وردەئێسکەکانی کرد، گوتی:( ئەوە وردە ئێسکی پەنجە قرتاوەکانی تۆن).

گوتم:(گەورەم ئەوە نرخی نییەو گرنگ ئەوەیە تۆ سەلامەتی، ئێستاش ئەگەر رێم بدەن بەدەستی چەپ لەجاران باشتر دەجەنگێم).

بەسارد و سڕییەکی بێزارکەرەوە گوتی:( جەنگی چی! ؟ ئێمە لەوەتەی هەین لەم کۆشکە چۆڵ و هۆڵەی نێو ئەم بیابانە دوورەدەستەداین).

گوتم:( ئەی ئەو هەموو جەنگەی کەکردمان).

گوتی:( ئەوە خەونبوو یان گەمەیەك بوو، هەر لەمنداڵییەوە پێی راهاتبووین، من دەبوومە کاپتن و تۆش جەنگاوەرێکی دڵسۆز و ئیدی بەخەیاڵ هەموو ئەوەمان کرد کەکردمان، هەر لەمنداڵییەوە تۆ بەنەخۆشییەك پەنجەکانی دەستەراستت هەڵوەرین و ئیدی لەوڕۆژەوە پێکەوە لێرەدا دەژین).

زۆر سەرسام بووم بەوەی کە کاپتن پێیگوتم، نەدەکرا هەموو ئەوەی کەبووبوو خەیاڵ بێت، روانیمە ئاوێنەکە، خۆمبووم لەجێی کاپتن لەئاوێنەکەوە دەمڕوانییە خۆم، لەکاپتن گەڕام لەوێ نەبوو.

چوومە دەرەوە و تاوێك بەنێو کۆشکە چۆڵەکەدا گوزەرمکرد، سەیرمکرد دەمێکە شەو بەسەرچووە و واچێشتەنگاوە. بەرانبەر پانتایی بیابانەکە تاوێك رامام، بیرم لەهەموو ئەو جەنگانە کردەوە کەبەخەیاڵ لەبیابانەکەدا کردبوومان، هەروەك ئەوەی بەڕاستی روویدابێت، هێشتاکە رینگەی تیر و

دەنگی لێکدانی شمشێرەکان و حیلەی ئەسپە سەرکێشەکانی نێو گەرمەی جەنگەکانم دەهاتە گوێ، لەگەرمەی ئەو خەیاڵانەدا کاتێکم زانی وردە ئێسکەکان لەنێو دەستمدان و بێئاگا گەمەیان پێدەکەم.

## ئەو دیو دەرکە کۆنینەکە

نازانم پاش گەڕانەوەم بۆ چەندەمین جار بوو بەرانبەر دەرکە کۆنینەکە رابوەستم و تێیبڕوانم. تەنها کەللەسەری کەڵەکێوییەك زیادیکردبوو کەنەمدەزانی پاش سەفەرکردنم کێ ڕاویکردووە و بۆ بەتایبەتیش جیاواز لەشوێنی هەڵواسینی ئەو جۆرە کەللەسەرانە لەدەستەراستی بەشی سەرەوەی دەرکەکەدا هەڵواسرابوو. بێهوودە دەمڕوانییە ئەو دەرکە کۆنینەی کە ڕۆژگارێکی تەمەنم لەودیوییەوە بردبووە سەر. هەر لەسەرەتای گەڕانەوەمدا هەستمکرد نەك هەر لەبەردەم دەرکە کۆنینەکەدا بەڵکو لەکووچە و کۆڵان و شوێنەکانی تریشدا کەس تێمناڕوانێت، هەروەك ئەوەی کەنەمبینن، یان دەیانبینیم و نەیاندەویست خۆیان واپیشان بدەن کەدەمبینن. لەسەرەتادا ئەمەم لابووە لوغز و پرسیارێکی بێوەڵام، هەتا دواتر و لەئەنجامی مانەوە و گەڕانمدا هەندێ شتی دیکەم بۆ روونبۆوە، گەرچی لەراست و دروستی ئەوانیش بەتەواوی دڵنیانەبووم و نیم. چەندین رۆژم لەچاوەڕێبوونی کەسێکدا بردەسەر کەبمبینێ، تابتوانم پرسیاری لێبکەم، هەرچەندە بەبێگوێدانە ئەوەش هەر پرسیارم لێدەکردن، بەڵام هیچ وەڵامێکم نەدەهاتە گوێ، پیادەڕەوەکان بەخێرایی بەلامدا گوزەریان دەکرد، هەندێکیشیان هەر هەڵدەهاتن، هەموو ئەمانەشیان بەشێوەیەك دەکرد کەقەناعەت بکەم، نامبینن و ئەوان کەسانێکن پەلەیانە یان بۆ خۆیان لەشتێکی نەزانراو هەڵدێن.

ئەوە بوو لەبەرەبەیانێکی زوودا کاتێك لەبەردەم دەرکە کۆنینەکەدا راوەستابووم و پێنەدەچوو خەون ببینم، یان بەڕاستی لەوێ نەبم. هەر لەخۆمەوە پرسیارم لەپیرەژنێکی پیادەڕەوکرد کەبەپێچەوانەی هەموو ئەو کەسانەی بەبەردەممدا گوزەریانکردبوو، زۆر لەسەرەخۆ هەنگاوی دەنا و هەر لەسەرەتای دەرکەوتنییەوە هەستم بەوەکرد دەمبینێ. هەر کەگەیشتە لام پرسیارە دووبارەبۆوەکەی خۆممکرد، کەهەردەم بەو پرسیارەدەستم پێدەکرد و بێوەڵامی هەموو ئەوانەی کەئەو پرسیارەم لێکردبوون وای لێدەکردم کەبەدوایدا هیچیتر نەڵێم:

(– ئێرە ماڵی کێیە؟

– ماڵێکی چۆڵە!

– ئەی پێشتر ماڵی کێبووە؟

– ماڵی کەس نەبووە!

– چۆن ماڵی کەس نەبووە؟

– ماڵی پیرەمێرد و پیرەژنێك بوو، دەمێك ساڵە مردوون.

– ئەی کوڕەکەیان چیلێهات؟

– بیست ساڵە لەم گەڕەکەدام و نەمبیستووە منداڵیان هەبووبێت.

– ئەی من ناناسیتەوە؟

– من کەس ناناسمەوە).

هەر لەخۆمەوە گومانم لەقسەی ئەو پیرەژنە هەبوو، بەڵام چەندم لەخۆمکرد، زاتی ئەوەمنەکرد لەدەرکەکە بدەم یان وەك جاران لەسەر دیوارەکەوە خۆم هەڵدەمە ئەودیوەو بچمە ژوورەوە. لەوکاتەدا نمەی باران تێکەڵ بەفرمێسکە ساردەکانم دەبوو کەدەمێك ساڵبوو هەستم بەبوونیان نەکردبوو. هاوکات بایەکی سارد گەمەی بەگەڵا زەردەکانی درەختەکانی نێو حەوشەی ماڵانی کۆڵانەکە دەکرد کە دەمێکبوو نەمڕوانیبووە وەرینیان. لەو ڕۆژەدا پێشئەوەی ئەوێ جێبهێڵم، قۆچێکی شکاوی کەللەسەرەکە جودا لەجارەکانی تر سەرنجی ڕاکێشام. کووچە و کۆڵانەکان وەك جاران نەیاندەناسیمەوە و لەپێچ و پەناکانیدا هەستم بەنیگەرانی دەکرد، دڵنیابووم پێشتر هەموو ئەوەی کەئێستا دەمبینی شتێکی تربوون، شتێکی چێژبەخش بوون، بەڵام لەئێستادا هەموو ئەوەی کەدەمبینی بێتامبوو، تەنها شتێك کەوەکجارانی لێدەکردمەوە و بەواتایەك لەواتاکان زیندووی دەکردمەوە بینینەوەی ئەودیو دەرکە کۆنینەکە بوو. هەرچەندە هەستم نەدەکرد زۆر دەمێك بێت ئەو شوێن و جێگەیەم جێهێشتبێت. زۆر جار ئەم قسانەی سەرۆك تیمەکەمانم دەهاتەوە یاد:

( – دکتۆر دەبێت هەموو ئەو شتانەی کەدەیبینیت و ئەوانەشی کەپێی هەڵدەستیت، وەك نهێنییەك لای خۆتان بیپارێزن.

– بێگومان.

– دەبێت ئاگادار بیت و ئەوەش باش بزانیت درکاندنی تووشی گێچەڵت دەکات یان ڕەنگە...).

پێشئەوەی سەفەرەکەم دەست پێبکات، لەژوورێکی دوورەدەستی قەراغ شاردا شەوێکم بردەسەر و تارۆژ بۆوە لەتاو سەرما و دەرکەوتنی تارمایی دێڵەسەگێك هیچ نەخەوتم، هەر پێڵووەکانم لێکدەنا دەهاتە پێشچاوم و زمانی بەشێوەیەکی نائاسایی دەهێنایەدەر، گەرچی وەك پەیکەرێك تا لەبەرچاوانم وندەبوو هەر ئاوا دەمایەوە، بەڵام پەیتا پەیتا زمانی ئارەقەیەکی هێجگار بۆن ناخۆشی لێدەچۆڕا.

پێشئەوەی قاتە ڕەشەکەم لەبەربکەم و جانتاکەم بپێچمەوە، ونبوونی گۆرەوییە سپییەکانم لابووە کێشە و تائێستاش لەنهێنی ونبوونی تێنەگەیشتم، شتێکی لۆژیکی نەبوو لەو ژوورە بچکۆلەیەی کەبەئاستەم جێگەی خۆمی تێدا دەبۆوە جووتێ گۆرەوی ڕەنگ سپی لەڕەشایی ژوورەکەدا ونبن، تەنها لەبەر ئەوەی کەسپیبوون دەبووایە بینرابان.

بەرەبەیان چەند ئۆتۆمبیلێك لەبەردەرکەی ژوورەکەدا ڕاوەستان و بەپێی پەتی پەلکێشیانکردم و بردیانمە نێو یەکێك لەئۆتۆمبیلەکان کەشۆفێرەکەی گزگلێك بوو، بەئاستەم پێشەوەی خۆی دەبینی. هیچ نەترسام و دوودڵیش نەبووم، دڵنیابووم کەئەمەش یەکێکە لەتاقیکردنەوەکانی سەرۆکی تیمەکەمان. بیرم نەماوە چەند جێگە و شوێنمانکرد و لەکوێشەوە چووینە کوێ، پێدەچوو بەدرێژایی سەفەرەکە خەوتبێتم یان ویستبێتم وەك خەوتوویەك خۆم پیشانبدەم . هێندەم خۆشبوو تا خۆم

لەگۆڕەپانێکی گەورەدا بینییەوە، حەشامەتێکی قەرەباڵغ پێشوازییان لەتیمەکەمان کرد و بێجگە لەمن، بەزەردەخەنەوە لەیەکەیەکەی ئامادەبووان وردبوونەوە. کاتێك کەهەموویان دانیشتن تەنها من بەپێوە مامەوە، ژمارەی کورسییەکان هێندەی ژمارەی ئەوان بوو.

هەرچەندە بەزۆر زمان لەوێدا قسەدەکرا و هەندێکیشیان یەکەمجارم بوو بیانبیستم، بەڵام لەوە حاڵیدەبووم هەر هەموو ئەوانەی کەدەدوان باسیان لەتاوانێکی ناوازە دەکرد، هەر کاتێکیش باس دەهاتە سەر تاوانبارەکە فۆتۆگرافچییەکان وێنەیان دەگرتم و کەسانی سەر بەکەناڵە جیاجیاکانیش هاوێنەی کامێرا ڤیدیۆییەکایانیان لەروو رادەگرتم . پەیامنێری رۆژنامە و سپیکەری کەناڵەکانیش لەکاتی قسەکردنیاندا دەنگیان زوڵاڵتر و قەویتر دەبوو، حەماسەتێکی سەیر دەیگرتن و کەتێیان دەڕوانیم نەفرەت لەچاوەکانیان دەباری. پرسیارەکان هێندە زۆر بوون، کەبەزەحمەت ئەو چەند کەسەی سەر بەتیمەکەمان بوون و کاریان وەڵامدانەوە بوو، فریا دەکەوتن.

نازانم بۆ تاوێك وامهەستکرد لەپەراوێزی هەموو ئەوەدابم کەلەوێدا روویدەدا، بۆ تاوێك وەك ئەوەی لەمابەینی خەوتن و بێداریدابم، خۆم لەهۆڵێکی گەورەدا بینییەوە، خۆم و سەرجەم ئەندامانی تیمەکە دەمانڕوانییە جەستەی کچۆڵەیەکی تازە پێگەیشتوو، پاش ئەوەی راپۆرتێکیان لەسەر حاڵەتی ناوازەی ئەو کچۆڵەیە خوێندەوە و ئاماژەیان بەنەبوونی رێگەچارەکرد، نەشتەرگەریی ئەو حاڵەتە ناوازە و بێچارەسەرەیان بەمن سپارد.

کەللەزلێك کەلەدوامەوە راوەستابوو لەناکاو شتێکی پێداکێشام و بێداریکردمەوە، سەرۆك تیمەکەمان لێم نزیك بۆوە و پەڕەیەکی نووسراوی دایەدەستم و فەرمانی پێدام کەدەبێت بیخوێنمەوە، بەهێمنی و لەسەرەخۆ کەوتمە خوێندنەوەی:

(بەڕێزان ئەو کچۆڵەیەی کەپێشتر باسی لێوەکرا، تەنها جەستەیەکی ساف و لووسبوو، هیچ کونتۆچکەیەکی دەردانی ئارەق و رژێنەکان لەجەستەیدا نەبوو، هەر بۆیە تەنها لەمیانەی زمانییەوە کەبەردەوام لەدەرەوە بوو، وەك دێڵەسەگێك هەناسەی دەدا، منیش پاش ئەوەی لەگەڵی نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێك، بێئاگا و بەدەر لەویستی خۆم زمانیم گەست).

پاش تەوابوونی قسەکانم، سەرۆك تیمەکەمان بەشێوەیەکی هستیریانە نەڕاندی:

(کەس گوێی لەهیچ نەبووە، دەنگهەڵبڕە).

چەند جارێك بەدەنگی بەرز هەمان نووسراوم خوێندەوە و بەرووکاری ئامادەبووانەوە دیاربوو کەسیان گوێیان لەهیچ نییە. لەناکاو سەرۆك تیمەکە و چوار کەسی زرتەبۆز لێم نزیکبوونەوە و لەوەدابوو پانتۆڵەکەم دابکەنن، کاتێك هاوارمکرد و گوتم:(مەکەن).

سەرۆك تیمەکە بەسەر راوەشاندنەوە گوتی:(ئەوەتانێ دەنگت هیچ عەیبی نییە). ئەمجارەیان بەریتمێکی خێرا و بارێکی دەروونی شپرزەوە نووسراوەکەم خوێندەوە، لەکاتێکدا خۆم گوێم لەهیچ نەبوو، بەئاکاری حەشامەتەکەدا دیاربوو، زۆر بەباشی گوێیان لێمە و سەرسامن بەوەی کەلەزاری منەوە دەیبیستن.

لەسەرەتای سەفەرەکەمدا ئەمە روویدا و پاشان نازانم برامە کوێ و چۆن چۆنی ساڵانێکی ژیانم

بردەسەر، تێکەڵ بەدنیای خەیاڵ و خەون هەندێك شتم بیر دەکەوتەوە، بەڵام رەنگە بەتەواوی دڵنیانەبم لەوەی کەڕاستە، چونکە هەندێکی هەر بەتەواوی لەخەون دەچێت. بەڵام ئەو ساتەم باش لەبیرە کەلەپاڵ درەختێکی بەساڵاچوودا بەئاگاهاتم و پاش گەڕان و سۆراخکردنی چۆنیەتی گەڕانەوەم بۆ ئەو شارەی کەلێوەی هاتبووم، شۆفێرك کەنەمدەناسی رێگەی پێدام بچمە نێو پیکابە مۆدێل کۆنەکەیەوە و بەڵێنی پێدام بەرێگەیەکی خۆڵاویدا بمباتەوە بۆ ئەو شارەی کەمەبەستم بوو بۆی بگەڕێمەوە، لەرێگا هیچی لێنەپرسیم و هەر کەگەیشتین، پێش ئەوەی دەم هەڵبێنمەوە و بڵێم پارەم پێنییە، گوتی :( من هەموو رۆژێك لەم کاتەدا دێمە ئەم شارە، تۆش نەبوویتایە هەر دەهاتم، بەئاسوودەیی رێگەی خۆت بگرەبەر و برۆ).

نەبینرانم لەلایەن خەڵکی شارەوە، لایەنێکی باشی هەبوو، هەر کەبرسیم بووایە بەئارەزووی خۆم چیم پێخۆش بووایە، هەر ئەوەندەی دەستم پێی بگەیشتایە هەڵمدەگرت و دەمخوارد، نەمدەزانی ئاخۆ لەناخەوە پێیاننناخۆشە یاننا، بەڕاستی رۆڵی کەسێکی نەبینراویان دابووە من ، گەرچی سەرەتا زۆر نارەحەتی دەکردم، بەڵام پاش ماوەیەك پێیڕاهاتم و ئاسایی بوو بەلامەوە کەسێکی نەبینراو بم. تا لەرۆژێکدا گەیشتمە ئەو یەقینەی هۆکاری ئەوەی کە خۆیان وادەخەنە روو کەنامبینن، ترسانیانە لێم. ئەویش پاش ئەوەی لەنێو ئەو بینادارماوەی شەوانە تێیدا دەمامەوە، شێتێکی ناسراوی شارم بینی کەپێشتر دوور بە دوور چەند جارێك بینیبووم، دیار بوو نەیزانیبوو ئەوە شوێنی مانەوەمە، هەر کەبینیمی زۆر شڵەژاو بەپەشۆکاوییە هەستایە سەرپێ و لەوەدا بوو هەڵبێت، بەڵام بەرم پێگرت و گوتم:( بەس ئەوەندەم پێبڵێ دەمبینیت یان نا). ئەوە بوو وەڵامێکی زۆر نائاسایی دامەوە و هەر کاتێکیش کەوەبیرم دێتەوە پێکەنینم دێت، گوتی:( ئەگەر بتبینم لێمدەدەیت یان نەتبینم).

ئیدی پاش ئەوەی کەئەو شێتە ئەوەی پێگوتم، زۆرجار بیرم لەوە دەکردەوە تۆ بڵێی لەکەسێکی ئەمشارەم دابێت بەڵام کەی و چۆن، پێش سەفەرەکەم یان دوای سەفەرەکەم، یان ئەوە تەنها قسەی شێتێك بوو، ئەی باشە ئەی ئەگەر لەترساندا نەبێت بۆ خەڵکی شارەکە نامبینن، یان نایەنەوێت بمبینن. گەرچی من پێش سەفەرەکەشم پێوەندیم بەهیچ کەسێکەوە نەبوو، لەشارێکی زۆر دووردا خوێندنم تەواوکردبوو، سەرۆکی تیمەکەشم بەرێکەوت هەر لەوێ ناسیبوو.

رۆژانە دەچوومەوە بەردەم دەرکە کۆنینەکە و بەهیوای کرانەوەی دەرکەکەی چاوەڕێ دەبووم، شەیدا بوونێکی سەیرم بۆ بینینی ئەو دیوی دەرکە کۆنینەکە هەبوو، لەوەزیاتر کەتەمەنێکی منداڵی و هەرزەکاریم تێدا بردبووە سەر، لەوە زیاتر کەدایك و باوکم لەپشت ئەو دەرکەیەوە چاوەڕێی گەڕانەوەمبوون. من هەمیشە ئەو دەرکەیەم وەك دەرکەی بەهەشت سەیر دەکرد، تەنها لەوێدا هەستم بەئاسوودەیی کردبوو، هەستم بەوەکردبوو کەسانێك هەن توانای ئەوەیان هەیە بەڕاستی منیان خۆش بووێت، منیان بووێت و چەندین شتیتر کەتەنها لەپشت ئەو دەرکەیەدا هەبوو.

دەرکەکە بێجگە لەزیادبوونی کەللەسەری کەڵەکێوییەکە، هیچ گۆڕانێکی بەسەردانەهاتبوو. دوای ماوەیەك لەبینینەوەی رۆژانەی پێی قەڵسبووم و بڕیارمدا لەشوێن خۆیهەڵیکەنم بەڵام هەرچییەکم کرد لەشوێن خۆی بۆم نەبزووا و بەناچاری دەستبەرداری ئەو کارە بووم و جارێکی تر نەمڕوانییە

کەللەسەری کەڵەکێوییەکە، دواتر هەستم بەرانبەری گۆڕا و بڕیارمدا بەزەییم پێیدابێتەوە، چونکە ئەو هیچ ئیرادەیەکی لەهەڵبژاردنی ئەو دەرکەیەی ئێمەدا نەبووە، ئەمە جگە لەوەی رەنگە هەرگیز بەتەمای ئەوە نەبوبێت بکوژرێت، چجای کەللەسەرەکەی لەشوێنێکی وادا هەڵبواسرێت. بەڵام شکانی قۆچێکی هەرچەند دەکرا بێهیچ مەبەستێك کەسێك شکاندبێتی بەڵام گریمانەی ئەوەشم دەبینییەوە لوغزێك لەشکاندنەکەیدا هەبێت کەهیچ کاتێك بۆم روونەبێتەوە.

ئیدی من ئەو پیاوە نەبینراوە بووم رۆژانە کاتێکی دوور و درێژم بەراوەستان بەرانبەر دەرکە کۆنینەکە دەبردەسەر و نەمدەویست کۆڵبدەم، لەئەگەری بینینەوەی ئەو دیوی دەرکەکە، بازنەیەکی ونبوو لەژیانمدا هەبوو، بۆم نەدەدۆزرایەوە، هەموو ئەوەی کەبیرم دەکەوتەوە پاساوێك نەبوون بۆ نەبینەوەی ئەودیوی دەرکەکە.

لەکاتێکدا قەناعەتی تەواوم بەو گەمەی نەبینراوییەم کردبوو، بەڵام پێش بینینی ئەو خەونەی کەوای لێکردم بڕیاری جێهێشتنی شارەکە بدەم. شتێکی سەیر روویدا بگرە زۆر سەیریش چونکە تا ئەو کاتەش لەو پیرەژن و شێتە زیاتر کەسی تر نەیویستبوو خۆی وانیشان بدات کەدەمبینێ. لەئێوارەیەکی درەنگ وەختدا کچێکی خوێندکار کەهەمیشە ئەو دەمانەی لەبەردەم دەرکە کۆنینەکەدا رادەوەستام بەبەردەممدا رەتبوو، لەو ئێوارەیەدا جیاواز لەجارەکانی پێشوو کەنەیدەویست بمبینێت، بینمی و زۆر بەهێمنی لێمنزیك بۆوە و بەبێدەنگی

رۆژنامەیەکی کۆنی لەبەردەممدا جێهێشت. کاتێك روانیمە رۆژنامەکە بەرواری دەرچوونی و ژمارە و ناونیشانەکەیم بۆ نەخوێندرایەوە، جگە لەکاریگەری شێ و زەمەن، بەوەدەچوو کەسێك بەئەنقەست سڕیبێتیەوە.

بابەتێك کەلەو رۆژنامەیەدا سەرنجی راکێشام، باسی لەدکتۆرێکی نەخۆش دەکرد لەرووی دەروونییەوە، کاتێك کچۆڵەیەك بەمەبەستی عەمەلیاتکردنی دەچێتە لای، لەئان و ساتێکی نادیاریکراودا دەستدرێژی سێکسی دەکاتە سەر و

پاش خوێندنەوەی ئەم هەواڵەو لەشەوێکی ئەنگوستە چاودا، خەونم بەسەرۆك تیمەکەمانەوە بینی، بەتەوسەوە و چەند جارێك ئەم دێڕەی دووبارە کردەوە:( تازە تۆ ئەو دیو ئەویش پاش دوو کاتژێر گیانی لەدەست دەدا و دەمرێت.دەرکە کۆنینەکە نابینیتەوە).